# ڕێزمانا فەرمی

غازی عەلی خورشید

سلێمانی ٢٠١٣

ناوی کتێب: ڕێزمانا فەرمی

نووسینی: غازی عەلی خورشید

بابەت: ڕێزمان

دیزاینی ناوەوە: سەیران عەبدولڕەحمان فەرەج

دیزاینی بەرگ: ئارام عەلی

تیراژ: ٥٠٠ دانە

نرخ: ٥٠٠٠ دینار

چاپی یەکەم: چاپخانەی (سەردەم)-ساڵی ٢٠١٣

کوردستان _ سلێمانی

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەگشتییەکان ژمارە (٢٦٣٨) ی ساڵی ٢٠١٣ پێدراوە

# ناوەڕۆک

# پێشەکی

هەتا نها لە کوردستان جیاوازیی لە ناڤبەرا زمانا قسە و نووسین ناهێتە کردن. لە پێش کوردان دوو بژارە هەیە: یان زمانەکا نووسین، فەرمی یان ستاندارد کو دەبێ بێتە پەسەندکردن؛ یان بەردەوام بوون بە ڕەوشا هەنووکەیی کو هەر نووسەر، ڕۆشنبیر و ڕامیارسازەک بە کەیفا خۆ و لەگور/بەپێی دەڤەر، دەڤۆک، زاراڤە و هتد. دەپەیڤێ و دەنووسێ.

سەپاندنا یەک زاراڤە و جووت یان سێ و چار ستانداری ناکردەنی و نەزانییە! بەلێ بۆ زمانەکا یەکگرتی یان ستاندارد کو نووسین و گوتنا کوردان لە باکوور تا باشوور، لە ڕۆژهەلات تا ڕۆژئاڤا لە بوارێن فەرمی یەک دەخا.

ئەگەر کورد دەولەت بڤێ، دەبێ دام و دەزگەێن فەرمی هەبێ. دام و دەزگەێن فەرمی بە زاراڤە، دەڤۆک و دیالێکت ناهێتە ڕێڤەبردن. دەولەت بە زمانا فەرمی دێتە ڕێڤەبەری کردن. زمانا فەرمی پێویستی/پێدڤی بە ڕێزمانا فەرمی هەیە. ئەڤ پەرتووکە ژی ڕێزمانا فەرمییە.

نها/ئێستا پێدڤی نووسەر و خوێنەرێن کورد بۆ ڕێزمانەکا یەکگرتی/فەرمی ئاشکرا دیارە؛ پەرتووکەکا ڕێزمان کو بۆ تێگەیشتن ئاسان بێ و وەکو بناغە لە لایەن زۆرینەی/پرانی کوردان بێتە بەکارهێنان. بۆ ئەڤ مەبەستە ئەڤ پەرتووکە فێرکارییە هاتیە دارشتن کو باس لە ڕێسائێن ڕێزمانی دەکا و شارەزایی دەربارەی یاسائێن فۆنۆلۆجی (دەنگ و تیپ)، مۆرفۆلۆجی (وشەسازی) و سینتاکس (ڕستەسازی) بە خوێنەران پێشکەش دەکا.

ئەڤ پەرتووکە باس لە ڕێسائێن ڕێزمانیی زمانەکا یەکگرتی دەکا کو لە بوارێن فەرمی دێتە بەکارهێنان. لە بوارێن فەرمی دەبێ هەموو کوردان بێنە ئاخافتن و

گوهداری کردن. لەوما/بۆیە زمانا بەکارهاتیی بوارێن فەرمی دەبیَ زمانا هەڤپشک بیَ و لە لایەن هەموو کوردان بێتە تێگەیشن. ئاشکرایە بوارا فەرمی تشتەکا سروشتی نییە، بەلکو تشتەکە کو هاتیە دروست کردن. بە هەمان ئاوایی، رِێزمانا فەرمی تشتەکا سروشتی نییە بەلکو رِێزمانەکە کو لەسەر بناغەی دیالێکتان و زاراڤان هاتیە رِێکخستن و دروستکردن. ئەڤ پەرتووکە لەسەر بناغەی دیالێکتێن کوردی، نەخاسمە هەردوو دیالێکتێن کرمانجیی ژووروو و خواروو، هاتیە دانان.

لە کۆتاییدا/دووماهیدا ئەڤ پەرتووکە لەگۆرِ پێکهاتەی زمان هاتیە دارِشتن. زمان لە دەنگ، وشە و رِستە هاتیە پێکهاتن. من لە پشکا یەکەم بە پێویست زانی کو دەستنیشانا دەنگێن/تیپێن کوردی بکەم و باس لە فۆنێم، گرافێم، مۆرِفێم و برِگە بکەم. پشکا دووهەم و سێهەم باس لە رِێزمان دەکا. رِێزمان لەگەل پێکهاتەی وشە و رِێکخستنا رِستە پەیوەستە. پشکا دووهەم باس لە پێکهاتە و جۆرێن وشە "وشەسازی" دەکا. لە پشکا سێهەم، بێجگە باسکردنا شێوە و ئەرکا رِێزمانی و رِۆلا واتایی وشە لە رِستە، باس لە گریَ و رِستە دێتە کردن. پشکا چارەم چیرۆکەکە کو بە زمانا فەرمی هاتیە نووسین.

غازی عەلی خورشید

## ١.١ دەنگ و تیپ

پێشتر، بە ئارمانجا دروستکردن و ڕێکخستنا زمانا نووسین، شارەزاێن زمانا کوردی کۆشش کرد کو لە هەمبەر هەر دەنگەک یەک تیپ هەبێ. ئەڤ ئارمانجە تاکو ڕادەی بەرچاڤ هاتیە جێبەجێکردن. ئەمرۆ بە گشتی، تێگەیشتنا خوێنەرێن کورد وسایە کو لە هەمبەر هەر دەنگەک یەک تیپ هەیە. ئەڤ تێگەیشتنە شاشە لێ بووە بە هۆکارا ڕەنگڤەدانا زمانا قسە لە نووسین. بە ئاواییەکی دی هەر تشتەک کو دێتە قسە دێتە نووسین! ئەڤە گەلەک ئاریشە لە پێش ڕێکخستن و یەکخستنا زمانا کوردی، هەروەها نزیکخستنا دیالێکتێن کوردی لە یەکدی، دروستکردیە. لە ڕاستیدا ئەڤە بووە بە هۆکارا دوورکەفتنا دیالێکتێن کوردی لە هەڤدی. ئەڤە ئاساییە کو چەندایەتی دەنگ و چلونایەتیی بێژانکردنا دەنگێن دیالێکت و دەڤۆکێن کوردی وەک یەکدی نییە لێ لە دەما دروستکردن و ڕێکخستنا زمانا نووسین ئارمانجا گشتی و نەتەوەیی بە هەند نەهاتیە وەرگرتن. بە کورتی هەتا نها، نووسەرێن کورد لە ڕوانگەی خودی، نەک ڕێزمان، دەنووسن. ئەڤژی گەلەک ئاریشە بۆ نووسەران و خوێندەواران دروست کردیە و دروست دەکا[1].

---

[1] بۆ نموونە بنەڕە: ئیسماعیل تەها شاهین (٢٠٠٨). ژ بۆ ڕێنڤیسەکێ چێتر. ئەکادیمیای کوردی (٢٠١٠). *ڕاسپاردەکانی کۆنفرانسی بەرەو ڕێنووسێکی یەکگرتووی کوردی.*

نها پێویسته/پێدڤییه، کو سەبارەت بە ژمارەی دەنگ/تیپ و چلۆنایەتی بێژانکردنا وشەێن کوردی، مامۆستا و شارەزایێن زمان ڕێکبکەفن، نەخاسمە مامۆستاێن هەردوو دیالێکتێن سەرەکیی کرمانجیی خواروو و ژووروو. ئەز لە کتێبا (زمانی فەرمی بۆ کوردستان) لە پاش هەمبەرکردنا پتر لە ٦٠٠ وشە لە ناڤبەرا هەموو دیالێکتێن کوردی (ک.ژ.، ک.خ.، لوڕی، هەورامی و زازا) لە ڕوانگەی فۆنۆلۆجی، سیمانتیک و دیالێکت پێشنیارا هەندەک خال بۆ زمانا فەرمی کردیە. من ڤان پێشنیاران لەگەل هەندەک گۆڕانکاری و چەند خالەکا دی نیشان دەدەم[٢]:

### ١.١.١ ڕوانگەی فۆنۆلۆجی

١. گەلەک جار یەک وشە لە گشت دیالێکتان (ک.خ.، ک.ژ.، لوڕ، هەورامی و زازا) وەک یەک دێتە گۆتن و نووسین بۆ نموونە: *گەنم*، *دۆ*، *ماست*، *چیمەن*. وشەی لە ئەڤ جۆرە بە وشەی زمانا فەرمی دێتە ژماردن.

٢. هەندەک جار هەندەک وشە بۆ هەر دیالێکتەک بە چەند شێوە دێتە گوتن بۆ نموونە لە ک.ژ. *زڤستان* و *زستان*، لە ک.خ. *زستان* و *زمسان*، لە هەورامی و لوڕی *زمسان* و لە زازا *زڤستۆن* و *زڤستان*. من لە ئێرە وشەی *زستان* بۆ زمانا فەرمی بە پەسەند دەزانم چونکە وشەکە لە لایەن زۆرینەی/پڕانی دانیشتوانا کوردستان دێتە بەکارهێنان.

---

[2] ئەڤە لەسەر بنەمای ژێدەرا الامیر جلادت بدرخان و روجیە لسکو "قواعد اللغە الکردیە اللهجە الکرمانجیە". ترجمە و نشر دلاوەر زنکی. سالا چاپکردن نەدیارە. هەلبەت ڤان پێشنیاران لەسەر بنەمای ئیتمۆلۆجیی وشە نەهاتیە دامەزراندن.

٣. هەندەک وشە بە جۆرەها شێوە لە دیالێکتان دێتە گوتن بۆ نموونە: ئەستێرە و هەسارە (ک.خ.)، ستێر (ک.ژ.)، هەسارە (هەورامی و لوڕ) و ئەستارە (زازا). ڤان وشان لە ڕوانگەی فۆنۆلۆجی زۆر لە یەکدی نزیکن بەلام من "ئەستێرە" بۆ زمانا فەرمی هەڵدەبژێرم چونکە دەنگی /ئە/ لە /ستێر/ هاتیە بڕین و لە /ئەستارە/ دەنگی /ا/ بە /ێ/ هاتیە گۆڕین. بەلام وشەی "هەسارە" دەکرێ وەکو هەڤواتا بێتە بەکارهێنان.

٤. لە ک.ژ. هەندەک وشە مینا "گوتن" و "جووت" بۆ "گۆتن" و "جۆت" هاتیە گۆڕین، واتە دەنگا /و/ بۆ /ۆ/ دێتە گۆڕین. دەنگا /و/ بۆ زمانا فەرمی دروستە.

٥. پترکردنا دەنگا /ت/ لە کۆتایی هەندەک کردارێن دەما نها مینا: دبێژێت، دەچێت، دەمرێت، دەخوات هتد. ئەڤ دیاردەیە لە هەردوو دیالێکتێن سەرەکی دیارە. بۆ زمانا فەرمی دەبێ دەنگا /ت/ بێتە لابردن؛ واتە دەبێژێ، دەچێ، دەمرێ، دەخوا دروستە.

٦. فڕێدانا دەنگا /و/ نەبزوێن لە هەندەک وشە لە ک.ژ. بۆ نموونە: خاردن و خاستن. خواردن و خواستن دروستە.

٧. گۆڕانا دەنگا /ف/ لە بڕگەی <u>فتن</u> <u>ftin</u> بۆ /ڤ/ یان لابردنا ئەڤ دەنگە لە ک.ژ. و هەروەها بۆ /و/ لە ک.خ. بۆ نموونە لە: هەنگاڤتن/هەنگاوتن، ئاخاڤتن/ئاخاوتن و کەتن/کەفتن. هەلبەت دەنگا /ف/ لە لوڕی و هەندەک دەڤۆکێن ک.خ. دێتە بەکارهێنان. بەلێ دەنگا /ف/ بۆ زمانا فەرمی دروستە؛ واتە ئاخافتن، کەفتن و هەنگافتن بۆ زمانا فەرمی دروستە.

٨. وشە هەیە کو لە ئەنجاما گۆڕانکاری دوور و درێژا فۆنۆلۆجی لە هەر دوو دیالێکتێن سەرەکی هاتیە گۆڕین؛ بۆ نموونە جیاوازیێن فۆنۆلۆجی لە ناڤبەرا وشەی /هاڤین/ و /هاوین/، /شت/ و /تشت/ و /نیاسین/ و /ناسین/. لە

گۆڕ بنەمای فۆنۆلۆجی وشەی دروست بۆ زمانا فەرمی دێتە هەڵبژاردن. بۆ نموونە وشەی /تشت/ و /سارد/ دروستن لێ /شت/ و /سار/ دروست نییە چونکە دوو وشەکەی پاشتر بە بەردەوامیی کات دەنگەک لێهاتیە بڕین. هەروەها من وشەی /هاڤین/ و /زراڤ/ بە دروست دەزانم لە هەمبەر /هاوین/ و /زراو/ ئەڤژی بۆ کێم کردنا دیفتۆنگ و بە مەبەستا ڕوونتر دەستنیشانکردنا دەنگا بزوێن. دیسان من وشەی وەک /ناسین/ و /ڕژان/ و /گەڕان/ بە پەسەند دەزانم لە هەمبەر /نیاسین/، /ڕژیان/ و /گەڕیان/ چونکە وشەێن پاشتر، بێجگە لە هۆکارێن دیفتۆنگ، یەک دەنگ بۆ هاتییە زێدەکردن.

٩. من بزوێنا درێژ لە هەمبەر بزوێنا کورت پەسەند دەکەم بۆ نموونە دەنگا /ە/ تاکو /أ/ وەک لە ئامرازا پێشبەند /لە/ لە هەمبەر /لأ/، هەروەها دەنگا /ا/، /و/ و /ۆ/ لە هەمبەر /ە/ وەک لە مانگا، کو و بۆق تاکو مانگە، کە و بەق، دیسان دەنگا /ێ/ لە هەمبەر دەنگا /ە/ مینا کێم لە هەمبەر کەم.

١٠. ئاساییانە لە زمانا کوردی دوو وشە پێکڤە دێتە لکاندن و گۆڕین بۆ نموونە "لە ئەم" دەبێ بە "لەم"، "ژ ئەوێ" دەبێ بە "ژێ"، "ب وی" دەبێ بە "ڤێ یان پێ" هتد. لە زمانا فەرمی/نووسین دەبێ ڤان وشان لە یەکدی بێنە جوداکردن. بە ئەڤ دیاردەیە دەگوترێ سووان.

١١. لابردنا دەنگا زیادی /ە/ بۆ نموونە لە وشەی گندۆرە، داپیرە، نەینۆک. وشەی گندۆر، داپیر و نینۆک بۆ زمانا فەرمی دروستە.

١٢. لابردنا دەنگا زێدەی /ێ/ بۆ نموونە لە پێرێ و بەسرپێرێ. وشەی پێر و بەسرپێر دروستە.

١٣. لە هەندەک وشە لە ناڤبەرا دەنگا /ھ/ و /و/ تێکەلی دەکرێ بۆ نموونە <u>هرچ</u> و <u>هشک</u> لەگەل <u>ورچ</u> و <u>وشک</u>. بە بووچوونا من <u>ورچ</u> و <u>وشک</u> باشە. ڤان وشان لە دوو برگە پێکهاتییە. لە زمانا کوردی هیچ وشەیەک بە دەنگا بزوێن /و/ دەست پێناکا.

١٤. لە هەندەک وشە دەنگا /ئ/ جێگای /ھ/ دەگرێ، بۆ نموونە لە <u>ئاریکاری</u> و <u>ئێستر</u>. وشەی <u>هاریکاری</u> و <u>هێستر</u> بۆ زمانا فەرمی دروستە. لە ئێرە پێدەچی کو دەنگا /ھ/ هاتبێ فرێدان یان گۆران. نموونەی دی: <u>هێنان</u> لە ک.ژ. بووە بە <u>ئانین</u>؛ بینە/بێنە لە بهینە/بهێنە هاتیە وەرگرتن. لە هەردوو ک.ژ. و ک.خ. <u>هێلان</u> نەهاتیە گۆڕین؛ مرۆڤ دەبێژێ بهیلە/بهێلە. بەلێ دەنگا /ھ/ بۆ زمانا فەرمی دروستە.

١٥. لە ئەنجاما پرۆسەی فۆنۆلۆجی دەنگا /د/ کو لە پاش دەنگا /ر/ دێ بە /ت/ هاتیە گۆڕین بە تایبەتی لە هەندەک دەڤۆکێن ک.ژ.. بە بەراورد لەگەل دەنگا /د/ شوێنا بێژانکردنا دەنگا /ت/ نزیکترە لە شوێنا بێژانکردنا دەنگا /ر/. بۆ نموونە <u>هەلبژارتن</u> زمانا قسەیە نەک نووسین. قسە خێرا دێتە گوتن. لەوما دەنگا /د/ لە ئەڤ جۆرە وشانە بۆ دەنگی /ت/ دێتە گۆڕین. واتە دەنگا /د/ دروستە بۆ زمانا فەرمی. لە ئێرە دەکرێ هەندەک نموونەی دی بێتە نیشاندان؛ مینا: <u>دێم</u>، <u>دێنم</u>، <u>دێشێ</u> بۆ <u>تێم</u>، <u>تێنم</u> و <u>تێشێ</u> کو لە ک.ژ. و هەندەک دەڤۆکێن ک.خ. و لوڕی دێتە گۆڕین. هەروەها پێشبەندا /د/ لە ک.ژ. کە پێش جێناڤ دێ، هەنگێ دەنگێ /د/ بۆ /ت/ دێتە گۆڕین بۆ نموونە: <u>د وێ</u>، <u>دوی</u>، <u>د ڤی</u> هتد. بۆ <u>تێ</u> دێتە گۆڕین. تەنانەت <u>د هەڤ</u> و <u>د ئێک</u> بۆ <u>تەڤ</u> و <u>تەک</u> دێنە/هاتیە گۆڕین.

١٦. لە زمانێن ئێرانی کۆن و هەورامی/زازا و لوڕ و هەندەک دەڤۆکێن ک.خ. دەنگا /م/ وەک کۆن دێتە بەکارهێنان بەلام لە هەمبەر ئەڤە لە ک.ژ دەنگا

/ڤ/ و له ک.خ. /و/ دێته بەکارهێنان بۆ نموونه: نیم، پیم، خام و هەنگام بۆ نیو/نیڤ، پیو/پیڤ و خاڤ/خاو و هەنگاو/پێنگاڤ هاتیه گۆڕین. به مەبەستا نزیکخستنا هەردوو دیالێکتێن سەرەکی نیڤ، پیڤ، خام و پێنگاڤ بۆ زمانا فەرمی دروسته.

١٧. هەندەک وشه بەپێی چوونا کات یان نەزانی هاتیه بەروڤاژکردن بۆ نموونه تیپ، خاک و زیخ بۆ زمانا فەرمی دروسته بەڵام پیت، ئاخ و خیز هاتیه بەروڤاژکردن.

١٨. دێته گوتن کو له ک.ژ. دەنگی /ڵ/ نییه بەلام بەپێی گوێبیستا من له ئاخێوەرێن ک.ژ. ئەوا ئەوان بۆ هەندەک وشه دەنگا /ڵ/ بەکاردەهێنن هەروەکو ک.خ.، لوڕ، هەورامی و زازا. تەنانەت بۆ پڕانی وشەێن کو دەنگا /ڵ/ یان /ل/ ی هەیه ئەوا دەنگا /ل/ی ساده گۆڕانکاری بەسەر هاتیه و بەرەو لای دەنگا /ڵ/ ی قەڵەو دێته کشان. دیسان جیاوازیێن دەنگ له نێوان /ل/ و /ڵ/ بۆ ژمارەیەکی زۆر کێم له وشه دەبێ به هۆکارا جیاوازیی سێمانتیکی بۆ نموونه <گول> و <گوڵ>، <کەل> و <کەڵ>. هەرچۆنەک بێ، به مەبەستا کێمکردنا جیاوازیی فۆنۆلۆجی له ناڤبەرا هەردوو دیالێکتیێن سەرەکی، تەنها دەنگی /ل/ له زمانا فەرمی هەبێ، باشتره. دیسان هێشتنەوەی خەسڵەتێن (پەسەن) هەر دیالێکتەک کارەکی باشه، بۆ نموونه ئەگەر مرۆڤەک دەنگی /ل/ی له قسه بەکارهێنا هەنگێ مرۆڤ دەزانێ کو ئاخێوەر/قسەکەر سەر به ک.ژ. یان به پێچەوانه.

## ١.١.٢ ڕوانگەی واتا/سێمانتیک

١. وشە دەکرێ هاوواتا بێ بۆ نموونە *لووت*، *کەپوو* و *پۆز*.

٢. وشە دەکرێ ئاماژە بە کردارەک بدا کو ئاراستەی تشتەک دەکرێ تاکو ئامازە بە تشتەکە بکا بۆ نموونە *پشیلە* ئاماژە بە گیاندارەک دەدا لێ کتک یان کتە ئاماژە بە دەنگەک یان گوتنەک دەدا کو مرۆڤ بە ئەو گیاندارە دەبێژێ داکو گیاندارەکە لە ئەو جێگەیە دووربکەفێ. لە ئێرە وشەی پشیلە دروستە بۆ زمانا فەرمی.

٣. وشە هەیە کو لە زمانێن بێگانە بۆ دیالێکتەک هاتیە قەرزکردن بۆ نموونە *زەرزەوات* لە خضروات، *خنزیر* و *خەزال* لە زمانی عەرەبی بۆ ک.ژ. هاتیە. بە ڤان وشان لە ک.خ. دەگوترێ *سەوزە*، *بەراز* و *ئاسک* کو وشەێن کوردییە. هەلبەت وشەی کوردی بۆ زمانا فەرمی دێتە پەسەند کردن.

٤. وشە هەیە کو ئاماژە بە زیندەوەرەک یان تشتەک دەدا کو ناوەڕۆکەکا نەرێنی دەبەخشێ بۆ نموونە *داپیرۆک* بە *جالجالۆکە* دەگوترێ. لە ئێرە ئەڤ ئاژەڵە کو هەردەم خەریکا داونان و نێچیرکردنە لەگەل مرۆڤەکا مێ و پیر دێتە نەخشاندن. من وشەی جالجالۆکە بۆ زمانا فەرمی پەسەند دەکەم.

٥. دوو وشە دەکرێ هەڤواتا بن بەلام لە کۆنتێکستا جودا بێنە بەکارهێنان؛ وەکو *پێشنیاز* و *پێشنیار*. پێشنیاز لەگەل نیازا مرۆڤێن تاک تاک دێتە پەیوەستکردن لێ پێشنیار لە بوارێن فەرمی بێتە بەکارئینان باشترە.

٦. واتای دوو وشە دەکرێ نزیک بن لە یەکدی لێ مەرج نییە هەڤواتا بن بۆ نموونە: جوداکردن هەمان واتای هەڵاواردن نابەخشێ. هەڵاواردن بە واتای بۆ نموونە جوداکردنا نەرێنی کۆمەلەک مرۆڤ کو خودانا خەسڵەتا/پەسەنا جیاوازن وەکو ئایین، زمان، ڕەگەز هتد. لە کۆمەڵگادا.

٧. وشه هەیه کو بە شێوەیەکا/ئاوایییەکا سروشتی لە دیالێکتەک هەیە بەلام لەبەر نەبوونی هەمان وشە لە دیالێکتێن دی، وشە هاتییە داتاشین. وشەی جڤین و هەڤدیتن لە ک.ژ. بۆ زمانا فەرمی دروستە. لە ک.خ. کۆبوونەوە و چاوپێکەوتن دێتە گوتن.

٨. بە مەبەستا ئاسانکاری، من وشەی کورت تاکو درێژ بۆ زمانا فەرمی بە پەسەند دەزانم. بۆ نموونە ڕێڤەبەر و ڕێڤەبەری تاکو بەڕێوبەر و بەڕێوبەرایەتی.

### ١.١.٣ لە ڕوانگەی دیالێکتۆلۆجی

١. ئەگەر بڕیار لەسەر وشەی دروست بۆ زمانا یەکگرتی/فەرمی نەیەتە دەرکردن ئەوا/هەنگێ یارمەتی لە دیالێکتێن هەورامی، زازا و/یان لوڕی دێتە وەرگرتن. بۆ نموونە وشەی "شان" لە ک.خ.، لوڕ و هەورامی وەکو یەکە لێ لە کرمانجیی ژووروو دەبێ بە "مل". لە ئێرە من وشەی "شان" بۆ زمانا فەرمی بە پەسەند دەزانم. واتە ڕامیاریی زۆرینە بەرامبەر بە کەمینە دێتە پەیڕەوکردن.

٢. هەندەک جار واتای تشتەک بە چەندین جۆر لە دیالێکتەک دێتە گوتن بۆ نمونە "دڕک، دڕی، دڕدڕک و ستری"ە بە ک.ژ.، لە هەورامی "دڕەی"ە، زازا "تەل" ە، ک.خ. و لوڕ "دڕک". لە ئەڤ ڕەوشە من "دڕک" بۆ زمانا فەرمی پەسەند دەکەم.

## ١.٢ تیپێن کوردی

له مێژه شارەزایێن زمانا کوردی دەنگێن زمانا کوردی بۆ بزوێن و نەبزوێن دابەشکردنە. بۆ هەر دەنگەک هێمایەک/تیپەک هاتیە دانان. لە ئەڤ پەرتووکە هەردوو دەنگێن/تیپێن بزوێن و نەبزوێن دێنە نیشاندان:

### ١.٢.١ دەنگێن/تیپێن بزوێن

له زمانا فەرمی دەنگێن بزوێن له هەشت دەنگ پێک دێ[٣]:




---

[3] بڕوانە فۆنەتیک و فۆنۆلۆجی (غازی عەلی خورشید ٢٠١٠:١٣١). هەڵبەت هەشت دەنگێن بزوێن له زمانا کوردی هەیە.

له ڕێنووسێن عەرەبی هێما بۆ دەنگا /بزرۆکە، i/ نییە. ئەز پێشنیارا ئەڤ هێمایە دەکەم /ی°/، /ێ°/. واتە لە سەرووی دەنگا /ی/ بازنەیەکا بچووک هەیە.

## ١.٢.٢ دەنگ و تیپێن نەبزوێن

لە زمانا کوردی دەنگێن نەبزوێن بە ٢٧ هێما دێنە دیاریکردن، بەپێی نەخشەی ژێرڤە: هەلبەت من دەنگا /ڵ/ ئەژمار نەکردیە. واتە من دەنگا /ڵ/ بۆ زمانا فەرمی بە پێویست نەزانییە.

| شوێنی ئارتیكولەكردن | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| قورقوراگە<br>Glottal | قورگ<br>Pharygeal | زارە بچكۆلە<br>Uvular | مەلاشووی نەرم<br>Velar | ئارو/ مەلاشووی رەق<br>Alveo-palatal | ئارو<br>Alveolar | ددانی/ ئارو<br>Dental-alveolar | ددانی<br>Inter-dental | لێوی/ ددانی<br>Labio-dental | لێوی<br>bilabial | زینی دەنگی<br>voicing | جۆنیەتی ئارتیكولەكردن<br>Manner of articulation |
| ʔ ئ | | q ق | k ک<br>g گ | | | t ت<br>d د | | | p پ<br>b ب | كپ<br>گڕ | وەستاو<br>Stops |
| h ه | ħ ح<br>ʕ ع | | x خ<br>ɣ غ | ʃ ش<br>ʒ ژ | | | s س<br>z ز | f ف<br>v ڤ | | كپ<br>گڕ | خشۆک<br>Fricative |
| | | | | | tʃ چ<br>dʒ ج | | | | | كپ<br>گڕ | كۆسپەک<br>Affricative |
| | | | | | | l ل | | | | گڕ | لایی<br>Lateral |
| | | | ŋ نگ | | | n ن | | | m م | گڕ | لووتی<br>Nasal |
| | | | | r ر<br>R ڕ | | | | | | گڕ<br>گڕ | لەرزۆک<br>Rhotic |
| | | | | j ی | | | | | w و | گڕ | Glides<br>نیمچە بزوێن |

## ١.٣ دەنگ/فۆنێم و تیپ/گرافێم

ئێمە لە نووسین تیپ (گرافێم) بەکاردەهێنین. ئاساییانە لە زمانا کوردی یەک گرافێم لە نووسین بەرامبەر یەک فۆنێم/دەنگ دەوەستێ بۆ نموونە لە مار، دار و شار. بە ڤان وشان دەگوترێ بێژانا بەتیپکراو، واتە ئەو تشتەی کو دێتە گۆتن دێتە نووسین. هەندەک فۆنێمێن دی پێویستی بە پتر لە یەک تیپ هەیە بۆ نووسین بۆ نموونە /نگ/ لە وشەی *مانگ*. ئەڤ دیاردەیە لە زمانێن دی مینا ئینگلیزی، گەلەک ئاساییترە. لە ڕاستیدا پەیوەندی یەک بەرامبەر یەک لە نێوان دەنگ/فۆنێم و گرافێم/تیپ نییە. ئێمە بەهۆی گرافێم/تیپ قسەناکەین، بەلکو ئێمە تیپ/گرافێم وەک هێما بۆ نووسین بەکاردەهێنین.
دەنگ/فۆنێم لە شێوەی جودا جودا بێ واتایە و ئاساییانە وەکو بچوکترین یەکەی جوداکەر لە زمان دێتە پێناسەکردن. لە ڕێگەی ڤان وشان کو بە **کێمترین جووت** دێنە ناسین مرۆڤ دەتوانێ فۆنێم بە ئاسانترین شێوە باس بکا: مار، دار و شار. بەلابردنا فۆنێما (دەنگا) یەکەم /م/ لە وشەی یەکەم، مار، لە جیاتی ئەو دانانا /د/ یان /ش/ هەنگێ واتای وشەکە دێتە گۆڕین. بە ئەڤ شێوەیە فۆنێم بچوکترین یەکەی واتا جوداکەرە لە زمان.

## ١.٤ وشە و مۆرفێم

*کوڕەک هات. کوڕ — ەک هات.*

*کوڕەکە هات. کوڕ ـ ەکە هات.*

*کوڕان هاتن. کوڕ ـ ان هات ـ ن.*

*کوڕەکان هاتن. کوڕ ـ ەکان هات — ن.*

هەر کەس زمانەک بزانیٚ، ئەوا ئەوی/ئەویٚ دەستەلاٚت بەسەر چەندین یەکەی زمانی، مینا یەکەیٚن دەنگ و وشە، هەیە. ئەڤ مرۆڤە دەتوانیٚ ڤان یەکان بەپیٚی ڕیٚسایٚن زمانی پیٚکڤە بلکیٚنیٚ و دەربڕین دروستبکا.

ئیٚمە گاڤەک/کاتەک وشەی کوڕ لە کۆنتیٚکستەکا بەرینتر بەکاردەهیٚنین هەنگیٚ ناکریٚ لەگەڵ دەوروبەرا خۆ بە وشەی تاک تاک پەیوەندی دروستبکەین. لە ئیٚرە ئیٚمە پیٚویستی بە توخمی دی، مۆرفیٚم، هەیە داکو جۆرەها ڕستە دروستبکەین. ئەگەر ئیٚمە دەربارەی تەنها کوڕ-ەک قسەبکەین کو نادیارە ئەوا -ەک بۆ وشەکە پتر دەکریٚ، بەلاٚم ئەگەر ئیٚمە دەربارەی یەک کوڕ کو دیارە/ناسراوە قسەبکەین هەنگیٚ دەبیٚژین کوڕ -ەکە. ئەگەر ئیٚمە دەربارەی چەند کوڕ-یٚن نادیار/نەناسراو قسەبکەین ئەوا دەبیٚژین کوڕ-ان، لیٚ دەبیٚژین کوڕ-ەکان ئەگەر مرۆڤ دەربارەی چەند کوڕیٚن دیار/ناسراو قسەبکا. بنەڕە ڕستەیٚن سەرەڤە و (٢.١.٤).

مۆرفیٚم بچوکترین یەکەی زمانە کو خودانا واتا بیٚ. بۆ تیٚگەیشتنا پتر لە پیٚناسەی مۆرفیٚم، دەکریٚ وشە بەسەر واتایٚن هەلگرتی خۆ بیٚتە دابەشبکردن، مینا نموونەی سەرەڤە. کوڕ مۆرفیٚما فەرهەنگییە/لیٚکسیکالیٚیە کو لە فەرهەنگی وشە هەیە و واتا هەیە لیٚ -ەک، -ەکە، -ان، -ەکان مۆرفیٚمیٚن ڕیٚزمانیین و بیٚ واتان. لە ئیٚرە ڤان مۆرفیٚمان پاشگرن. مۆرفیٚمیٚن دی دەستنیشانا پلەیٚن بەراورد دەکا، بۆ نموونە لە هەڤالناڤا *قورس، قورس-تر، قورس-ترین*. لە ئیٚرە وشەی قورس فەرهەنگییە و واتا هەیە، بەلاٚم تر، ترین مۆرفیٚما ڕیٚزمانین و بیٚ واتان.

مۆرفیٚما پیٚشگرژی هەیە بۆ نموونە لە وشەیٚن: بیٚگومان، بەلەز، لەژیٚر. مۆرفیٚمیٚن پیٚشگر بیٚ، بە، لە بیٚ واتان، لیٚ گومان، لەز، ژیٚر خودانا واتان.

لە پشکا دوو نموونەیٚن دی دیٚنە دەستنیشان کردن و زانیاری پتر دیٚنە باسکردن.

## ١.٥ برگه

برگە یەکەیەکە، یان ڕێکخستنەکە، کو لە یەک یان زیاتر فۆنێم پێکدێ. هەر برگەیەک لە یەک دەنگا بزوێن و یەک یان زیاتر دەنگێن نەبزوێن کو لە پێش و/یان پاش ئەڤ دەنگە بزوێنە دێ پێکهاتییە. برگە زیاتر یەکەیەکا دەنگییە تاکو یەکەیەکا واتایی. ئەگەر ئێمە بزوێن/ڤاوڵ بە تیپا V و نەبزوێن/کۆنسونانت بە تیپا C دیاربیکەین هەنگێ لە زمانا کوردی دەکرێ ئەڤ چەند جۆر برگە بێنە دەستنیشان کردن:

کردن، مردن CCVCC

تو، کو، مێ CV

کار، گول، نان CVC

ورد، خورت، بەرد، نارد CVCC

چرا، برا CCV

و V (مینا ئامرازا یەکگرتی بۆ نموونە لە گرێی من و تۆ)

# ٢.١ ناڤ

له ڕوانگەی واتا ناڤ ئاماژە بە، بۆ نموونە زیندەوەر، شمەک و دیاردە دەدا. بە شێوەیەکا/ئاواییەکا سەرەکی ناڤ بەسەر ناڤا بەرجەستە، ناڤا نابەرجەستە و ناڤا تایبەت دێتە دابەشکردن:

## ٢.١.١ ناڤا بەرجەستە

ناڤا بەرجەستە دەربڕین لە هەبوونا فیزیکی تشتەک دەکا و لە ڕێگەی هەست ئەو تشتە دێتە دیاریکردن، مینا *ئاگر*، *مێز*، *ئاڤ*، *مندال*، *دەنگ*، *با*. ناڤا بەرجەستە بەسەر ناڤا چەشن، ناڤا مادی و ناڤا کۆمەڵ دێتە دابەشکردن:

- **ناڤا چەشن** ئاماژە بە زیندەوەر یان شمەک دەدا، مینا *سەگ*، *پەرتووک*، *مێز*، *کورسی* هتد.
- **ناڤا مادی** ئاماژە بە ژمارەیەکا نادیارکردیی مادە دەدا، مینا: *زێڕ*، *ئاو*، *هەوا*، *پەنیر*، هتد.
- **ناڤا کۆمەڵ** ئاماژە بە کۆمەلەک لە شمەک یان زیندەوەر دەدا کو وەک یەکەیەک لە لایەن زمان دێتە هەلسەنگاندن، وەک: *خێزان*، *دانیشتوان*، *مێروله* هتد.

## ٢.١.٢ ناڤا نابەرجەستە

ناڤا نابەرجەستە دەربڕین لە هەندەک دیاردە دەکا کو هەبوونا فیزیکی نییە:

- **خەسلەت/پەسەن**: مینا *هێز*، *باوەڕ*، *خەم*، *شەرم*، *هۆش*.
- **کردار**: مینا *دزی*، *یاری*، *جەنگ*.
- **ڕەوش**: مینا *شەڕ*، *ئاشتی*، *هێمنی*، *پەرێشانی*، *نەخۆشی*.

### ٢.١.٣ ناڤا تایبەت

بە ئەو جۆرە ئاماژە دەگوترێ کو وەک نیشانە بە زیندەوەر و دیاردەی تاک تاک دێتە لکاندن مینا ناڤا شار (دەرسیم، کرماشان)، هەروەها ناڤا شەقام، گەڕەک، کۆمپانیا، دەریا، تاڤگە، ڕووبار، ڕووداوێن دێروکی و کەلتووری هتد. هەروەها ناڤا تایبەت بۆ مرۆڤ و ئاژەل بۆ هەردوو نێر و مێ هەیە وەک:

ناڤا مرۆڤ بۆ نێر وەک ئازاد، کامەران، شڤان، دلێر. هەروەها ناڤا دی مینا: مێرد، پیاو، برا، باب، کوڕ، زاڤا، ئاپ/مام، خورت، پسمام هتد.. ناڤا پیشەی نێر مینا: نانەوا، شڤان، گاڤان، خزمەتکار. ناڤا مرۆڤ بۆ مێ وەک شیرین، دەلال، نێرگز، گولزار، شەونم. هەروەها ناڤێن دی مینا: خوشک، دایک، بوک، ژن، مەت/میمک/پور، کچ، کەنیشک هتد. ناڤا پیشەی مێ مینا: کابان، مامان (داپیرک)، بەربووک، بێریڤان و تەشی ڕێس.

ناڤا ئاژەل بۆ نێر وەک گا، کەلەشێر، ئەسپ، کەر و بەران. ناڤا ئاژەل بۆ مێ وەک مانگا، مریشک، ماین، ماکەر و مێ.

دیسان گەلەک ناڤ بۆ دەستنیشانکردنا هەردوو ئاژەلا نێر و مێ دێتە بەکارهێنان وەک: شێر، ورچ، کۆتر، گورگ و مار. ناڤا بێلایەن مینا دار، بەرد، شاخ، دەریا، ڕووبار هتد.[٤].

---

[4] لە کرمانجیی ژووروو، زازا و هەورامی ڕەگەز گەلەک چالاکە بەلام لە کرمانجی خواروو و لوڕ کێم چالاکە. لە ک.ژ. پڕانی ناڤ بۆ نێر و مێ دێنە جوداکردن بۆ نموونە: ناڤا ئەندامێن لەشا مرۆڤ بۆ مێ مینا پرچ، دفن "لووت"، لێڤ، تل "پەنجە"، ناڤک، چۆک، برۆ، سپل، زراڤ هتد.

هەروەها ناڤا مێ بۆ تشتێن بەرجەستە مینا: خۆر، هەیڤ، زەڤی، ئاڤ، بەفر، گول، تەندور، سیر، پیاز، باران هتد. دیسان هەموو ناڤێن نابەرجەستە و چاوگ وەک مێ دێتە ئەژماردن. ناڤا ئەندامێن لەشا مرۆڤ بۆ نێر مینا: سەر، چاڤ، گوێ، دەم، ددان، سینگ، دەست، ڕان، باسک هتد. هەروەها ناڤا نێر بۆ تشتێن بەرجەستە مینا: دەریا، ڕووبار، چەم، تاڤگە، سۆلاڤ (بێجگە لە جۆگە)، ڕەنگەکان، بەرهەما ئاژەلێن خۆمالی وەک شیر، پەنیر، نڤیشک هتد. (بێجگە خوری)، میتال وەک ئاسن، زیو هتد.، نان، ئاگر، خانی، باخ، چیا، گۆپال، ئاسمان، دیوار هتد. بۆ زانیاری پتر بنەڕە جگر خوین (١٩٦١:٢٧)، سادق بەهادین ئامێدی (١٩٨٧:١٧٦)، (ئیبراهیم ڕەمەزان زاخۆیی ٢٠٠٨:٤٩)، جەلادەت بەدرخان (١١٢) و (قەناتی کوردۆ ١٩٩٠:٤٤). هەلبەت بۆ مێ دەنگا /ا/ وەکو پاشکۆ لەگەل ناڤ دێتە لکاندن وەکو: قەلەما هێشین ، ئاڤا سار، مالا نوێ. هەروەها بۆ ڕەگەزا نێر دەنگا /ێ/ وەکو پاشکۆ دێتە لکاندن وەکو: دیوارێ سوور، نانێ سپی، ئارێ گەنم. هەرچۆنەک بێ، هەندەک ناڤێن نابەرجەستە و بەرجەستەی دوو لایەن هەیە، واتە ناڤ هەم نێرە و هەم مێ بۆ نموونە: خوندکار، نڤیسکار، هەڤال، خەباتکار، دوژمن، دۆست هتد. بۆیە/لەوما ئەگەر مرۆڤ بێژێ: "هەڤالا من" و "خانیا من " هەنگێ پاشگرا /ا/ و /یا/ نیشانەیە بۆ ڕەگەزا مێ. ئەگەر مرۆڤ بێژێ: "هەڤالێ من" و "خانیێ من" هەنگێ پاشگرا /ێ/ و /یێ/ نیشانەیە بۆ ڕەگەزا نێر. لەسەر هەمان بناغە مرۆڤ دەبێژێ "کوڕێ من" بەلام "کچا من".

هەروەها لە دەما بوری بۆ کردارێن تێنەپەڕ ئامرازێن نێر و مێ هەیە؛ واتە ئامرازا /ی/ نێر و /ێ/ مێ لەگەل کۆتایی ناڤ دێنە لکاندن. بۆ نموونە: سەرداری نان خارد. ئازادی دەرس خویند. سەروەری زەڤی ئاڤدا. هەروەها شرینێ شیڤ خارد. گولیێ تەشی ڕست. نازدارێ گیا دوری. هەروەها جێناڤێن کەسیی سێ تاک بۆ نێر /وی-ئەوی/ و بۆ مێ /وێ —ئەوێ/ هەیە. دیسان جێناڤێن دەست نیشانکردن /ڤی —ئەڤی/ بۆ نێر و /ڤێ —ئەڤێ/ بۆ مێ دێنە جوداکردن. بنەڕە بابەتێن پاشتر.

لە کرمانجیی خواروو یەک دۆخ هەیە و ناڤ لە گۆڕ ڕەگەز نایەتە دابەشکردن. واتە ناڤ نە نێرە نە مێ. تەنها ناڤا تایبەت دەستنیشانا نێر یان مێ دەکا. دەنگا پاشگر لە ک.خ. هەردەم /ی/ە بۆ نموونە: کوڕی من، کچی من، مالی ئێوە، خانیی تو هتد.. هەرچۆنەک بێ، لە ئامرازێن بانگکردن لە ک.خ. ژی جودایی د ناڤبەرا نێر و مێ دێتە کردن. بنەڕە ئامرازا بانگکردن لە (٢.١١.٤)!

## ٢.١.٤ ناڤا تاک و کۆ

جۆرا یەکەم: ڤان وشان کو بە دەنگا نەبزوێن کۆتایی/دووماهی دێ[5]

| ناڤا گشتی | ناڤا تاک/نادیار — ەک | ناڤا تاک/دیار — ەکە | ناڤا کۆ/نادیار — ان | ناڤا کۆ/دیار — ەکان |
|---|---|---|---|---|
| دار | دارەک | دارەکە | داران | دارەکان |
| بەراز | بەرازەک | بەرازەکە | بەرازان | بەرازەکان |
| ژن | ژنەک | ژنەکە | ژنان | ژنەکان |
| پووندک | پووندکەک | پووندکەکە | پووندکان | پووندکەکان |
| هاڤین | هاڤینەک | هاڤینەکە | هاڤینان | هاڤینەکان |
| جڤین | جڤینەک | جڤینەکە | جڤینان | جڤینەکان |
| ڕۆژ | ڕۆژەک | ڕۆژەکە | ڕۆژان | ڕۆژەکان |

جۆرا دووهەم: ڤان وشان کو بە دەنگا بزوێن کۆتایی دێ. ئەڤ جۆرە لەگۆڕ/بەپێی دەنگا بزوێن دێتە دابەشکردن[6]:

[5] ناڤا نادیار بۆ تاک/کۆ بۆ هەردوو ک.ژ. و ک.خ. وەک یەکدییە بەلام ناڤا دیار بۆ تاک/کۆ لە کرمانجیی ژوروو نییە. هەبوونا ناڤا تاک/کۆ بۆ دیار و نادیار بۆ ڕێزمان پێدڤییە/پێویستە. بنەڕە نمونەێن لاپەڕەی پاشتر کو دەربارا ئەڤ بابەتەیە.

[6] ناڤا کۆ/نادیار لە زمانا بەکارهاتی بە کێمی دێتە بەکارهێنان، نەخاسمە ڤان وشان کو بە بزوێنا (ە) دوماهی دێ. هەرچۆنەک بێ هەندەک جار ڕێسای ئاوارتە بۆ ناڤێن وسا هەیە بۆ نموونە: باخچە – باخ — باخات، سەوزە + سەوزەوات، میوە + میوەجات. دیسان هەندەک جار لە نێوان ناڤا کۆ/نادیار لەگەل ناڤا کۆ/دیار تێکەلی دێتە کردن بۆ نموونە برایان و براکان، خانییان و خانییەکان دێتە گوتن.

| ناڤا گشتی | ناڤا تاک/نادیار + یەک | ناڤا تاک/دیار کە/ەکە/یەکە | ناڤا کۆ/نادیار ان/یان | ناڤا کۆ/دیار + (ە)کان |
|---|---|---|---|---|
| فێرگە | فێرگەیەک | فێرگەکە | فێرگان | فێرگەکان |
| خونچە | خونچەیەک | خونچەکە | خونچان | خونچەکان |
| باخچە | باخچەیەک | باخچەکە | باخچان | باخچەکان |
| پەنجەرە | پەنجەرەیەک | پەنجەرەکە | پەنجەران | پەنجەرەکان |
| دەستە | دەستەیەک | دەستەکە | دەستان | دەستەکان |
| مردوو | مردوویەک | مردووەکە | مردووان | مردووەکان |
| مێروو | مێروویەک | مێرووەکە | مێرووان | مێرووەکان |
| ئەستوو | ئەستوویەک | ئەستووەکە | ئەستووان | ئەستووەکان |
| مانگا | مانگایەک | مانگاکە | مانگایان | مانگاکان |
| برا | برایەک | براکە | برایان | براکان |
| دەریا | دەریایەک | دەریاکە | دەریایان | دەریاکان |
| خورما | خورمایەک | خورماکە | خورمایان | خورماکان |
| مامۆستا | مامۆستایەک | مامۆستاکە | مامۆستایان | مامۆستاکان |
| کانی | کانییەک | کانییەکە | کانییان | کانییەکان |
| رێڤی | رێڤییەک | رێڤییەکە | رێڤییان | رێڤییەکان |
| مراوی | مراوییەک | مراوییەکە | مراوییان | مراوییەکان |
| قوتابی | قوتابییەک | قوتابییەکە | قوتابیان | قوتابییەکان |
| رێڤەبەری | رێڤەبەرییەک | رێڤەبەرییەکە | رێڤەبەرییان | رێڤەبەرییەکان |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| خانی | خانییەک | خانییەکە | خانییان | خانییەکان |
| هەرمێ | هەرمێیەک | هەرمێکە | هەرمێیان | هەرمێکان |
| مێ | مێیەک | مێکە | مێیان | مێیەکان |
| جێ | جێیەک | جێکە | جێیان | جێکان |
| ئەژنۆ | ئەژنۆیەک | ئەژنۆکە | ئەژنۆیان | ئەژنۆکان |
| برۆ | برۆیەک | برۆکە | برۆیان | برۆکان |
| زانکۆ | زانکۆیەک | زانکۆکە | زانکۆیان | زانکۆکان |

هەندەک نموونە کو دەستنیشانا ناڤێن تاک بۆ دیار و نادیار هەروەها ناڤێن کۆ بۆ دیار و نادیار دەکا:

١. دەرگەڤان: دەرگەڤان دەرگا دەگرێ. دەرگەڤانەک دەرگا دەگرێ. دەرگاڤانەکە دەرگا دەگرێ. دەرگەڤانان دەرگا دەگرن. دەرگاڤانەکان دەرگا دەگرن.

٢. هەرمێ: هەرمێ دێتە خواردن. من هەرمێیەک خوارد. من هەرمێکە خوارد. من هەرمێیان دەخۆم. من هەرمێکان خارد.

٣. بەراز: گۆشتا بەراز نایەتە خواردن. ئەوی بەرازەک کوشت. ئەوی بەرازەکە کوشت. ئەوی بەرازان دەکوژێ. ئەوی بەرازەکان کوشت.

## ٢.١.٥ هێمای هەڤبەندی

هێمای هەڤبەندی بە ئەو هێمایە دەگوترێ کو ناڤ لەگەل وشەی دی بەند دەکا و پەسەن/خەسلەت، خاوەندارییی یان چلۆنایەتی ناڤەکە نیشان دەدا. لە پاش هێمای هەڤبەند دەکرێ ناڤ، جێناڤ، هەڤالناڤ و هەڤالکردار بێ.

یەکەم: هێمای هەڤبەندی لە ڕەوشا تاک و کۆ بۆ وان ناڤان کو بە دەنگا نەبزوێن کۆتایی هاتیە[7]:

| ناڤا تاک + ا [8] | ناڤێن کو+ ێن |
|---|---|
| کوڕا من | کوڕێن من |
| دەزگیرانا تو | دەزگیرانێن ئێوە |
| پەرتووکا ئازاد | پەرتووکێن ئازاد |
| چاڤا ئەوی | چاڤێن ئەوی |
| گوندا مەزن | گوندێن مەزن |
| ئەشکەفتا دێرین | ئەشکەفتێن دێرین |
| کچا نازدار | کچێن نازدار |
| شەقاما بەرین | شەقامێن بەرین |

[7] هێمای هەڤبەندی لە کرمانجیی ژووروو بە پێی ڕەگەزا نێر و مێ بۆ هەردوو تاک و کۆ جودایە: ا، ە، ێ، ی، ێد، ێت، ێن. لە کرمانجیی خواروو هێمای وابەستە /ی/ ە. هەرچۆنەک بێ جار جار هێمای /ە/ ژی دێتە بەکارئانین.

[8] لە ک.ژ. پاش ناڤا نادیار ئەگەر هەڤالناڤ پاش ناڤ هات هەنگێ هێمای هەڤبەندی بۆ ناڤ پتر دەبێ مینا بۆ مێ: ماهینەکا قنج. شەڤەکا سار، ئاڤەکا چەمان. بۆ نێر: گۆشتەکی سۆر. نانەکی هشک. دارەکی شڤان. واتە بۆ مێ دەنگا /ا/ و بۆ نێر دەنگا /ی/ پتر دەبێ. نموونەکان لە (جەلادەت بەدرخان ١٣٠) هاتیە وەرگرتن.

لە ک.خ. بۆ نێر و مێ بە ئەڤ جۆرە دەبێ: ماینی قنج، شەڤی سارد. نانەکی وشک. دارەکی شڤان.

دووەم: هێمای هەڤبەندی لە ڕەوشا تاک و کۆ بۆ وان ناڤان کو بە دەنگا بزوێن کۆتایی هاتیە:

| ناڤا تاک+ ی | ناڤێن کۆ+ ێن |
|---|---|
| بای سارد | بائێن سارد |
| زاڤای ئەوێ | زاڤائێن ئێوە |
| سەیدای هێژا | سەیدائێن هێژا |
| زانای مەزن | زانائێن مەزن |
| | |
| خەسووی من | خەسووێن ئێمە |
| مووی ناشیرین | مووێن کرێت |
| | |
| ئاپۆی گەورە | ئاپۆێن من |
| کەوی کوێستان | کەوێن کوێستان |
| | |
| میوەی جوان | میوەێن جوان |
| بەهرەی زۆر | بەهرەێن زۆر |
| پشیلەی ڕەش | پشیلەێن ڕەش |
| پێشمەرگەی کوردستان | پێشمەرگەێن کوردستان |
| | |
| ڕێڤیی فێلباز | ڕێڤیێن فێلباز |
| مراویی ڕەنگا و ڕەنگ | مراوییێن ڕەنگا و ڕەنگ |

تێبینی: جیاوازی لە ناڤبەرا ناڤا کۆ/ نادیار لەگەل هێمای هەڤبەندی کۆ بکە.
بنەڕە خشتەی ژێرڤە کو دەربارا ئەڤ بابەتەیە:

| ناڤا هەڤبەندی کۆ | ناڤا کۆ/نادیار |
|---|---|
| ئەسپ سوارێن ئێمە گەلەک جەسوورن. | ئەسپ سواران مالا ئێمە تالان کرد. |
| گولێن باخچە گەش بوو. | شیرین گولان دەچنیّ. |
| بەهارێن کوردستان ڕەنگینە. | مرۆڤ لە بەهاران گەشت دەکا. |
| زارۆکێن من دەچن بۆ قوتابخانە. | زارۆکان دەچن بۆ قوتابخانە. |

## ٢.١.٦ ناڤ و جێناڤێن نیشانە

### جێناڤا (نزیک) ئەڤ _ ڤان

### جێناڤا (دوور) ئەو _ وان

جۆرا یەکەم: ناڤ کو بە دەنگا نەبزوێن کۆتایی دێ[9]:

[9] جێناڤا نیشانە لە کرمانجیی ژووروو لە گۆر دۆخا ئاسایی و ڕەگەز بۆ چەند جۆر دێنە دابەش کردن وەک: ئەڤ/ئەو، ڤی/ئەڤی و وی/ئەوی(نێر)، ڤێ/ئەڤێ، و وێ/ئەوێ (مێ)، ڤان/ئەڤان، وان/ئەوان (کۆ).

| فەرمی | ک.ژ. |
|---|---|
| ئەڤ | ئە/ڤی (نێر)، ئە/ڤێ (مێ)، ئە/ڤان (کۆ) |
| ئەو | ئە/وی (نێر)، ئە/وێ (مێ)، ئە/وان (کۆ) |

| وشه | تاک — ه | کۆ — ان |
|---|---|---|
| شار | ئەڤ/ئەو شارە | ڤان/وان شاران |
| گوند | ئەڤ/ئەو گوندە | ڤان/وان گوندان |
| ولات | ئەڤ/ئەو ولاتە | ڤان/وان ولاتان |
| مرۆڤ | ئەڤ/ئەو مرۆڤە | ڤان/وان مرۆڤان |
| زارۆک | ئەڤ/ئەو زارۆکە | ڤان/وان زارۆکان |
| بازێڕ | ئەڤ/ئەو بازێڕە | ڤان/وان بازێڕان |
| دیڤار | ئەڤ/ئەو دیڤارە | ڤان/وان دیڤاران |
| کۆمپیوتەر | ئەڤ/ئەو کۆمپیوتەرە | ڤان/وان کۆمپیوتەران |
| شەڤ | ئەڤ/ئەو شەڤە | ڤان/وان شەڤان |
| هەیڤ | ئەڤ/ئەو هەیڤە | ڤان/وان هەیڤان |

جۆرا دووهەم: ناڤ کو بە دەنگا بزوێن کۆتایی دێ:

---

ئەڤ پەرتوکا منە. ئەو سێڤا تەیە. پەرتوکا ڤی یە. پێنوسا ڤێ سۆرە. ئەڤێ، ئەڤی. ڤان زەلامان. ڤێ بالیفێ. ڤی نانی. وێ لێنوسکێ. وی زێڕی.

جێناڤا نیشانە لە کرمانجیی خواروو دوو جۆرن: ئەم/ئەو بۆ تاک و ئەمان/ئەوان بۆ کۆ.

| وشه | تاک | زێدەکرد نا | کۆ | زێدەکرد نا |
|---|---|---|---|---|
| خۆزگه | ئەڤ/ئەو خۆزگەیە | | ڤان/وان خۆزگان | /ان/ |
| خونچه | ئەڤ/ئەو خونچەیە | | ڤان/وان خونچان | لێ |
| باخچه | ئەڤ/ئەو باخچەیە | یە | ڤان/وان باخچان | لابردنا |
| سەدە | ئەڤ/ئەو سەدەیە | | ڤان/وان سەدان | (ە) |
| دەیە | ئەڤ/ئەو دەیەیە | | ڤان/وان دەیان | |
| مێروو | ئەڤ/ئەو مێرووە | ە | ڤان/وان مێرووان | /ان/ |
| ئەستوو | ئەڤ/ئەو ئەستووە | | ڤان/وان ئەستووان | |
| مانگا | ئەڤ/ئەو مانگایە | | ڤان/وان مانگایانە | |
| برا | ئەڤ/ئەو برایە | | ڤان/وان برایان | |
| دەریا | ئەڤ/ئەو دەریایە | یە | ڤان/وان دەریایان | /یان/ |
| خورما | ئەڤ/ئەو خورمایە | | ڤان/وان خورمایان | |
| کانی | ئەڤ/ئەو کانییە | | ڤان/وان کانییان | |
| ڕێڤی | ئەڤ/ئەو ڕێڤییە | | ڤان/وان ڕێڤییان | |
| مراوی | ئەڤ/ئەو مراوییە | یە | ڤان/وان مراوییان | /یان/ |
| ڕێڤەبەری | ئەڤ/ئەو ڕێڤەبەرییە | | ڤان/وان ڕێڤەبەرییان | |
| خانی | ئەڤ/ئەو خانییە | | ڤان/وان خانییان | |
| هەرمێ | ئەڤ/ئەو هەرمێیە | یە | ڤان/وان هەرمێیان | /یان/ |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ئەژنۆ | ئەڤ/ئەو ئەژنۆیە | یە | ڤان/وان ئەژنۆیان | /یان/ |
| برۆ | ئەڤ/ئەو برۆیە | | ڤان/وان برۆیان | |
| زانکۆ | ئەڤ/ئەو زانکۆیە | | ڤان/وان زانکۆیان | |

بەکارئینانا جێناڤا نیشانە، کو ڕۆلا جێناڤا کەسا سێی هەیە، لە ڕستەی بێ کردار بۆ ناڤێن تاک/کۆ دەبێ بە ئەڤ جۆرە بێ:

| تاک | دووبارە | کۆ | دووبارە |
|---|---|---|---|
| ئەڤ/ئەو شاخە بەرزە . | ئەڤە/ئەوە بەرزە . | ڤان/وان شاخان بەرزن. | ڤانە/وانە بەرزن. |
| ئەڤ/ئەو شارە جوانە. | ئەڤە/ئەوە جوانە. | ڤان/وان شاران جوان. | ڤانە/وانە جوانن. |
| ئەڤ/ئەو زارۆکە زیرەکە | ئەڤە/ئەوە زیرەکە. | ڤان/وان زارۆکان زیرەک. | ڤانە/وانە جوانن. |
| ئەڤ/ئەو دەریایە بەرینە | ئەڤە/ئەوە بەرینە. | ڤان/وان دەریایان بەرینن. | ڤانە/وانە بەرینن. |
| ئەڤ/ئەو هەرمێیە خۆشە. | ئەڤە/ئەوە خۆشە. | ڤان/وان هەرمێیان خۆشن. | ڤانە/وانە خۆشن. |
| ئەڤ/ئەو زانکۆیە کەڤنە. | ئەڤە/ئەوە کەڤنە. | ڤان/وان زانکۆیان کەڤنن. | ڤانە/وانە کەڤنن |

## ٢.١.٧ ناڤێن نوێ

نموونەیێن پێشتر دەربارا ناڤێن سادە بوون مینا: کەو، نان، دایک، دەشت، باران، ئەژنۆ، هەنار هتد. لێ ناڤێن دارِشتی نوێ بە هاریکاری پاشگر چێ دەبێ. هەروەها ناڤێن نوێ لە ڕێگەی لێکدانا دوو ناڤ، ناڤەک لەگەل هەڤالناڤ، کردار، هەڤالکردار و ژمارە دێتە دروستکردن.

## ٢.١.٧.١ ناڤێن دارِشتی:

یەکەم: ناڤا سادە + پاشگر

| پاشگر | نموونە |
|---|---|
| گەر | ئاسنگەر، زیڤگەر، مزگەر |
| دار | گیاندار، دوکاندار، بریندار، ئەڤیندار |
| باز | سەرباز، کەوباز، کۆترباز، کەلەکباز |
| بەند | نالبەند، هەڤالبەند، تەختەبەند |
| ڤان | گاوان، دەزڤان، باخەڤان، نێچیرڤان |
| ین | سەرین، نڤین |
| چی | چایچی، قاوەچی، خانچی |
| مەند | هونەرمەند، هۆشمەند، دەولەمەند |
| کەر | ڕاڤکەر، خەباتکەر، نانکەر |
| گا | کۆگا، دەزگا، |
| گە | کارگە، هاڤینگە، پرسگە، ڕێگە، جێگە |
| دان | گولدان، شەکردان، کەڤچیدان، خوێدان، سۆزدان |
| خانە | چایخانە، بەندیخانە، مەیخانە، ئاشخانە |
| ستان | لوڕستان، گولستان، دارستان |
| زار | گولزار، لالەزار |
| لان | کوندەلان، میزەلان، بەردەلان |

| | |
|---|---|
| جاڕ | نێرگزەجاڕ، توتنەجاڕ |
| وار | شوێنەوار، کەڤنەوار، کولەوار |
| خانە | کتێبخانە، مەیخانە، چایخانە |
| چە | باخچە، دەریاچە، قالیچە |
| وور | دەستوور، زەمبوور |
| ەمەنی | شیرەمەنی، خاردەمەنی، چاپەمەنی |
| گار | پەروەردگار، ڕۆژگار، یادگار |
| گین | غەمگین، لەزگین، بەنگین، ڕەنگین |
| ل | زەنگل، گوینگل، پشقل |

دووەم: هەڤالناڤ + پاشگر

| پاشگر | نموونە |
|---|---|
| ی | کەسکی، جوانی، کرێتی/ناشرینی |
| ایەتی | بلندایەتی، کەمایەتی |
| لان | نەرمەلان، سەوزەلان، بەردەلان |
| ێنە | سپێنە، زەردێنە |
| کە | پیسکە، ڕەشکە |
| ندە | دڕندە، مەزندە |
| ەمەنی | ساردەمەنی، شیریەمەنی |
| ین | نازەنین، نەرمین، بەفرین، شەرمین |

سێهەم: کردارێن سادە (ڕەگا کردار+ پاشگر)

| نموونە | پاشگر |
|---|---|
| گوتار، کوشتار | ار |
| کڕیار، پرسیار | یار |
| نووسەر/نڤیسەر، دانەر | ەر |

چارەم: پاشگر+ هەڤالکردار

| نموونە | پاشگر |
|---|---|
| بنار | ار |
| پێشەوا | ەوا |
| بەرۆک، خالخالۆک، خشۆک | ۆک |

پێنجەم: ژمارە+ ناڤ

| نموونە | پێشگر |
|---|---|
| یەکئاهەنگ، یەکدەنگ، یەکپەرست | یەک+ ناڤ |
| دووپێ، دووڕوو | دوو+ناڤ |
| چارگۆشە، چارپێ، چارسوکە | چار+ناڤ |

## ٢.١.٧.٢ ناڤێن لێکدراو

ناڤا لێکدراو لە ئەنجاما لێکدانا دوو وشەی واتادار دێتە دروست کردن بۆ نموونە: ناف + ناڤ، ناڤ + هەڤالناڤ، ناڤ + هەڤالکردار، ناڤ + ڕەگا کردار هتد.
هەنووکە لەگەل هەندەک نموونە:

| جۆر | نموونە |
|---|---|
| ناڤ+ ناڤ | گولاو، شاهەنگ، گاسن، گەلامێو |
| ئاڤ+ ناڤ | ئاڤگۆشت، ئاڤگێڕ، ئاڤدەست، ئاڤزێڕ |
| چاڤ+ ناڤ | چاڤبرسی، چاڤفرە، چاڤتەنگ |
| ناڤ+ە+ناڤ | بەردەنوێژ، مانگەشەڤ، گولەگەنم، دەستەڤاژە |
| ناڤ+و+ناڤ | هێلکەوڕۆن، لەرزوتا، دەنگوباس |
| ناڤ+ هەڤالناڤ | مێرگەسۆر، کێلەسپی، ڕیش سپی |
| هەڤالناڤ+ ناڤ<br>هەڤالناڤ +ە +ناڤ | ڕەشمار، ڕەشمال، خۆشناڤ<br>گەنەموو، گەنەپیاو |
| هەڤالکردار+ناڤ<br>هەڤالکردار+ە +ناڤ | بەرمال، ژێرپیالە، ژێرکراس<br>پاشەلەقە، پاشەڕۆژ، پاشەڕۆ |
| دوو ناڤ | گڤەگڤ، قرچەقرچ، دەنگەدەنگ، بۆلەبۆل، توتەتوت، گڕەگڕ، |

# ٢.٢ جێناڤ

**جێناڤ بە ئاسانی نایەتە پێناسەکردن. هەندەک جێناڤ لە جێی ناڤ لە ڕستە دێنە دانان[10]:**

**ئازاد و نەوزاد بران. ئەوان بران.**

**دایکا ئازاد پزیشکە. ئەوێ پزیشکە.**

**جێناڤ لە ژمارەیەک جۆر پێکهاتییە و هەندەک جار دەستنیشانکرنا سنوورا جێناڤ لەگەل هەڤالناڤ و هەڤالکردار بە ئاسانی نایەتە دیاریکردن. ئەز هێدی هێدی باس لە ڤان جۆران دەکەم:**

## ٢.٢.١ جێناڤێن کەسی

| ژمارە | کەس | جێناڤا کەسی[11] | جێناڤا خودی |
|---|---|---|---|

[10] بۆ جێناڤ ڤان چەمکان هاتییە بەکارهێنان: زەمیر، کێشک، بۆناو و ڕاناو. بنەڕە ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی (٢٠١١:٢٥).

[11] لە کرمانجیی ژووروو جێناڤا کارا بۆ کەسا یەکەم تاک/کۆ بە ئەڤ جۆرەیە: ئەز/ئەم، تو/هون، ئەو/ئەوان. جێناڤا بەرکار بۆ کەسا یەکەم تاک/کۆ بە ئەم جۆرەیە: من مە، تە وە، ئەوی، "وی، ئەوێ"، وێ، ئەوێ"/ئەوان،وان. لە کرمانجیی خوارووی جێناڤ بۆ کارا (بکەر) و بەرکار نایەتە دابەش کردن چونکە جێناڤا کارا یان بەرکار لە ڕستە ئاشکرا دیارە. جێناڤا کەسی بۆ کرمانجیی خواروو بۆ تاک/کۆ بریتییە لە: من/ئێمە، تو/ئێوە، ئەو ئەوان. لە هەندەک دەڤۆکێن ک.خ. و ک.ژ لە شوونا هوون/ئێوە هنگۆ/ئەنگۆ و هەوە دێتە بەکارهێنان. لە گۆڕ خشتەی ژێرڤە ئەوا بکەر و بەرکار لە ڕستە ئاشکرا دیارە چونکە بکەر لە پێش بەرکار دێ:

| | | | |
|---|---|---|---|
| تاک | ١ | ئەز/من | خۆ |
| | ٢ | تو | خۆ |
| | ٣ | ئەوی (نێر)، ئەوێ (مێ) | خۆ |
| کۆ | ١ | ئێمە | خۆ |
| | ٢ | ئێوە/هوون | خۆ |
| | ٣ | ئەوان | خۆ |

## ٢.٢.٢ جێناڤێن کەسیی لکاو

ئەڤ جێناڤە پتر لەگەل تیپا کۆتایی کردار دێتە لکاندن.

| ژمارە | کەس | کردارێن نها تێپەڕ/تێنەپەڕ | کردارێن بوری/تێنەپەڕ |
|---|---|---|---|
| تاک | ١ | م | م |
| | ٢ | ی | ی |
| | ٣ | ێ، ا | (.)، ی |
| | ١ | ین | ین |
| | ٢ | ن | ن |
| کۆ[١٢] | ٣ | ن | ن |

---

***<u>من بە ئەوێ گوت. ئەوان بە ئێمە گوت. تو بە من گوت. ئێوە/هوون بە ئێمە گوت.</u>***

ئەز تو دەبینم. ئەوێ من دەبینێ. ئەوان هوون دەبینن. ئەوێ ئەوی دەبینێ.

[12] لە ک.خ. و لوڕ جێناڤێن لکاو **م/مان، ت/تان و ی/یان** هەیە. بە مەبەستا جوداکردنا زمانا نووسین لە قسە و نزیکخستنا ک.ژ. و ک.خ. لە یەکدی پێویستە/پێدڤییە ڤان جێناڤان بۆ زمانا فەرمی نەبێ. هەلبەت لە ک.ژ. ڤان جێناڤان نییە. بنەڕە نموونەێن ژێرڤە:

| ک.خ. | زمانا فەرمی |
|---|---|
| پێم وت | من بە ئەوی/ئەوێ گۆت |
| پێم وتی | من بە تو گوت |
| پێت وتم | تو بە من گوت |
| پێی وتم | ئەوی/ئەوێ بە من گوت |
| پێم وتن | من بە ئێوە/هوون گوت |
| پێیانم وت | من بە ئەوان گوت |
| پێتان وتم | ئێوە/هوون بە من گوت |
| پێیان وتم | ئەوان بە من گوت |

| ک.خ. | زمانا فەرمی |
|---|---|
| بابم — بابمان | بابا من — بابا ئێمە |
| بابت — بابتان | بابا تو — بابا ئێوە/هوون |
| بابی- بابیان | بابا ئەوی/ئەوێ — بابا ئەوان |

| ک.خ. | زمانا فەرمی |
|---|---|
| بۆم — بۆت — بۆی | بۆ من — بۆ تو — بۆ ئەوی/ئەوێ |
| بۆمان — بۆتان- بۆیان | بۆ ئێمە- بۆ ئێوە/هوون — بۆ ئەوان |

بەپێی قەناتێ کوردۆ (٩٩:١٩٩٠) هۆکارا لکاندن و خەپتاندنا جێناڤێن م/مان، ت/تان، ی/یان، واتە دروستبوونا ڤان جێناڤان، لەوانەیە ئەمە بێ: پێشتر لە زمانا کوردی جێناڤ لە ڕستە پاش کردار هاتیە بۆ نموونە: کرد من — کرد تو — کرد ئەوی. پاشتر بەهۆی گۆڕانکاری لە پرۆسەی فۆنۆلۆجی لە ک.خ. ئەوا ئەڤ جۆرە گوتنە بە ئەڤ جۆرە هاتیە گۆڕین: کردم — کردت — کردی. واتە فڕێدانا دەنگ لە جێناڤ بووە بە هۆکارا پەیدابوونا جێناڤێن لکاو. هەتا نها لە کرمانجیی ژووروو گەلەک جار لە ڕستەی ڕاگەیاندن مرۆڤ دەبێژێ: کتێب من نڤیسی" لە جیاتی "من کتێب نڤیسی" یان "نان تە خار" لە شونا "تە نان خار . بە ڤی ئاڤایی دەنگێن

نموونەی جێناڤێن کەسیی لکاو لە ڕستە:

بۆ کردارێن تێپەڕ:

| ژمارە | کەس | کردارێن نها | کردارێن بوری |
| --- | --- | --- | --- |
| تاک | ١ | ئەز نان دەکڕم | من/ئەز نان کڕی |
| | ٢ | تو نان دەکڕی | تو نان کڕی |
| | ٣ | ئەوی/ئەوێ نان دەکڕێ | ئەوێ نان کڕی |
| کۆ | ١ | ئێمە نان دەکڕین | ئەوان نان کڕی |
| | ٢ | هوون/ئێوە نان دەکڕن | هوون نان کڕی |
| | ٣ | ئەوان نان دەکڕن | ئەوان نان کڕی |

بۆ کردارێن تێنەپەڕ:

| ژمارە | کەس | کردارێن نها | کردارێن بوری |
| --- | --- | --- | --- |
| تاک | ١ | ئەز دێم | ئەز هاتم |
| | ٢ | تو دێی | تو هاتی |
| | ٣ | ئەوی/ئەوێ دێ | ئەوێ هات |

---

/م/، /ت/ و /ی/ لە کورتکردنا /من/، /تە/ و /ئەوی/ لە ک.خ. پەیدابووە. هەروەها بەپێی دێنیز ئێکچی (٢٠٠٧:١٠) دارشتنا بەرکار پێش بکەر هەتا نها لە باکوورا دیالێکتا ک.ژ. دێتە بەکارئینان مینا "یەک پۆزێ من هەیە" و "دوو دەستێن من هەیە" بەلام لە دەڤۆکا بادینان بەرکار لە پێش بکەر دێ و "من یەک پۆز هەیە" و "من دوو دەست هەیە" دێتە گوتن.

بە هەمان جۆر جێناڤێن لکاو بۆ کۆ لە دەنگێن /م/، /ت/ و /ی/ پەیدابووە. ئەو ژی بە پترکردنا نیشانەی کۆمکردن /ان/ بۆ نموونە ژن — ژنان، مێرد — مێردان. ولات- ولاتان. بە ڤی ئاڤایی /م/ بووە بە /مان/، /ت/ بووە بە /تان/ و /ی/ بووە بە /یان/.

| | | | |
|---|---|---|---|
| کۆ | ١ | ئێمە دێین | ئێمە هاتین |
| | ٢ | هوون/ئێوە دێن | هوون هاتن |
| | ٣ | ئەوان دێن | ئەوان هاتن |

### ٢.٢.٣ جێناڤێن کەسیی لکاو لە رستەی بێ کردار[١٣]

| ژمارە | کەس | جێناڤا کەسیی لکاو | لە ڕستە |
|---|---|---|---|
| تاک | ١ | م | من مەردم |
| | ٢ | ی | تو مەردی |
| | ٣ | ە/یە[١٤] | ئەوی مەردە |
| کۆ | ١ | ین | ئێمە مەردین |
| | ٢ | ن | ئێوە/هوون مەردن |
| | ٣ | ن | ئەوان مەردن |

### ٢.٢.٤ جێناڤا نیشانە[١٥]

| پانتایی | تاک | کۆ |
|---|---|---|
| نزیک | ئەڤ (ئەڤە) | ڤان (ڤانە) |
| دوور | ئەو (ئەوە) | وان (وانە) |

[13] لە نموونەی دی لەگەل جێناڤا نیشانە: ئەڤ سێفە خۆشە. ڤان سێفان خۆشن. ئەڤ خانییە گەورەیە.

[14] بۆ وان وشان کو بە دەنگا بزوێن دوماهی دێ، جێناڤێن کەسی بۆ کەسا سێهەم بە /یە/ کۆتایی دێ بۆ نموونە: ئەوێ/ئەوی ئازایە.

[15] بنەڕە ٢.١.٦ ناڤ و جێناڤا نیشانە.

### ٢.٢.٥ جێناڤا پرس

| | | |
|---|---|---|
| کێ | کەنگێ/کەی | کام/کیژ[١٦] |
| چەند | بۆچی | چی |
| کانێ/کوا | چۆن/چەوا | کوێ |

### ٢.٢.٦ جێناڤا چەندایەتی

#### ٢.٢.٦.١ جێناڤا ئامارژەداری فرەیی:

هەموو، هەردوو

#### ٦.٢.٢.٢ جێناڤا گشتی:

کەس، هەر کەس، فلان/بیڤان، فیسار/بیڤار، یارۆ.

#### ٢.٢.٦.٣ جێناڤا دابەشکردی

یەکەک، هەریەکەک، کەسەک، هەر کەسەک

#### ٢.٢.٦.٤ جێناڤا چەندیەتی:

چەند/چەندە، ئەوەندە، ئەمەندە، هێندە، هەندەک، چەندە، ئەمەندە، ئەوەندە[١٧].

---

16 کیژان، کامیان و کامتان هەیە لێ ڤان وشان بە زمانا قسە دێتە ئەژماردن. کیژان لە کیژ لە ڤان/وان هاتیە. کامیان لە کام لە ئەوان هاتیە. کامتان لە کام لە نێوە هاتیە.

### ٢.٢.٦.٥ جێنافا ڕێژەیی

زۆربە/پڕانی

### ٢.٢.٦.٦ جێنافا نادیار

جێنافا نادیار ئاماژە بە ژمارەک یان ڕێژەیەکا نادیار لە کەس و شمەک دەدات.

یەکەک، کەسەک، تشتێک، ژمارەک، گەلەک، زۆرەک هتد.

هەر- کەس/تشت (کەسەک، مرۆڤەک هتد.)

### ٢.٢.٦.٧ جێنافا هەیی:

هی، هی دی، هی دن (هی ئەوان، هی من، هی تو ...)

### ٢.٢.٦.٨ جێنافا نەبوو:

ئەڤ جێناڤە ئاماژە بە نەبوونا کەس، کەسەک، تشت، تشتەک هتد. دەدا. ئەڤ جێناڤە دوو دانەیە: هیچ و توو.

توو/هیچ- کەس، تشت، تشتەک، کەسەک هتد. هیچ کەس، تووکەس هتد.

### ٢.٢.٦.٩ جێنافا هەڤپشک:

یەکدی، هەریەک، هەردوو، هەڤدی، پێکەڤە، هەڤڕا.

---

[17] هەلبەت لە ک.ژ. ئەڤ هێندە/ئەڤەندە و ئەوەندە دێتە بەکارهێنان. لەوما بۆ زمانا فەرمی چقاس، ئەڤقاس و ئەوقاس نەپێدڤییە. من لە پشکا یەکەم "دەنگ/تیپ" گوت کو دەنگا /م/ بۆ /ڤ/ و /و/ هاتیە گۆڕین. بلا بۆ زمانا فەرمی ئەمەندە و ئەوەندە بێتە بەکارهێنان.

## ٢.٣ هەڤالناف

هەڤالناف بە ئەو وشە دەگوترێ کو بەیانا چۆنیەتی، خەسلەت/پەسن و نیشان و وابەستەیی کەسەک یان تشتەک دەکا. لە ڕوانگەی دەربڕین هەڤالناڤ خەسلەتێن/پەسنێن ناف یان جێناف لە ڕستە نیشان دەدا[١٨].

### ٢.٣.١ هەڤالناڤا چۆنیەتی

هەڤالناڤا چۆنیەتی خەسلەتا کەسەک یان تشتەک دیاردەخا مینا: سەوز، وشک، بەلەنگاز، ترش، پاکژ، ڕەزیل، بەرین، ئازا، نەبەرد، زراڤ، چالاک، تەمبەل، خورت هتد.

### ٢.٣.٢ هەڤالناڤا وابەستەیی

هەڤالناڤا وابەستەیی ئامارە بۆ کۆمەلەک یان توخمەک دەدا وەک: کوردی، فەڕەنسی، کرمانجی، ئەفریقی، دهۆکی، زستانی، گوندی، پۆلایی، دەشتەکی، پیاوانە، مندالانە هتد. ئەڤ جۆرە هەڤالناڤە لە ڕێگەی پاشگر دێتە دروستکردن.

---

18 بۆ هەڤالناف ڤان چەمکان هاتییە بەکارهێنان: سیفە، ئاوەڵناو، ناونیشانە، ڕەوش، پەسن، خەسیەتناف. بنەڕە ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی (٢٠١١:٦٦).

## ٢.٣.٣ هەڤالناڤا نادیار

هەڤالناڤا نادیار ئاماژە بە خەسلەتا تشتەکا یان کەسەکا دیاریکردی ناکا لێ واتای هەڤالناڤا نادیار دەکەڤێتە چوارچێوەی دەمەکا دیاریکردی. ئەڤ هەڤالناڤە بریتییە لە هەردوو هەڤالناڤێن جیاکردن (دی) و دیاریکردن (وسا)[١٩].

## ٢.٣.٤ هەڤالناڤێن نوێ

لە زمانا کوردی، وەک پرانی زمانێن جیهان، دەکرێ هەردەم هەڤالناڤا نوێ بێتە دروستکردن، بۆ نموونە لە رێگەی پاشگر و پێشگر (هەڤالناڤێن دارشتی)، یان لە رێگەی گرێدانا دوو وشە (هەڤالناڤێن لێکدراو).

### ٢.٣.٤.١ هەڤالناڤێن دارشتی

یەکەم: لە رێگەی پێشگر، بۆ نموونە:

| پێشگر | هەڤالناڤێن نوێ |
|---|---|
| بێ+ ناڤ | بێهۆش، بێهێز، بێگیان، بێویژدان، بێرەوشت، بێبار. |
| بە- ناڤ | بەهێز، بەجەرگ، بەبازوو، بەتوانا، بەپێز، بەتام، بەرێز. |
| نە+ | نەخۆش، نەساخ |

19 هەڤالناڤا نادیارا /دی/ بە چەندین جۆر دێتە گوتن مینا: ئیدی، تر، ئیتر، دیکە، ئیدیکە، کە، دن هتد. ئەز /دی/ بۆ زمانا فەرمی هەلبژارد چونکە لە هەردوو دیالێکتێن سەرەکی ک.خ. و ک.ژ. دێتە بەکارهێنان. هەروەها /وسا/ بە چەندین جۆر دێتە گوتن مینا: ئاوا، ئاوها، وەهە، وا، وەسا، وسان، ئەلیوا، ئوسا، وەرگ هتد. بۆ زانیاری پتر بنەرە رێزمانی کوردی. بەشی سێهەم — ئاوەڵناو — (د. ئەورەحمانی حاجی مارف ١٩٩١:٧٧) و باڤێ بەرزان (٢٠١١:١٦٣)

| | |
|---|---|
| هەڤالناڤ<br>نا+هەڤالناڤ | ناپاک، ناخۆش، نارێک، ناڕاست، ناپەسەند. |
| نە+ڕەگا<br>کردار<br>ب+ڕەگا<br>کردار | نەبەز، نەزان، نەمر، نەهات<br>بوێر، بنووس، بکوژ، ببڕ |

دووەم: لە رێگەی پاشگر بۆ نموونە:

| پاشگر | هەڤالناڤێن نوێ |
|---|---|
| ناڤ+ی | جیهانی، کەرکوکی، بەهاری، نارنجی، دێروکی، کرمانجی. |
| ناڤ+ین | زێڕین، ئاگرین، بەفرین، زیڤین، ئاسنین، ڕەنگین. |
| ناڤ+ن | ورگن، تووکن، شەرمن، چلکن، کۆکن، کرمن، کولمن. |
| ناڤ+دار | ئاگادار، ناڤدار، نازدار، زامدار، بریندار، دیندار، ئەڤیندار. |
| ناڤ+انە | پیاوانە، شاهانە، زانستانە، کوڕانە، کچانە، ژنانە. |
| ناڤ+انی | مێرانی، شەڕانی، کچانی، کوڕانی، ژنانی. |
| ناڤ+ ە | هاڤینە، بەهارە، زستانە، پایزە. |
| ناڤ+باز | فێلباز، کۆترباز، گیانباز، چەنەباز، حیلەباز، سەرباز. |
| هەڤالناڤ+انی | تەختانی، وشکانی، نەرمانی، ڕەقانی |
| ڕەگا چاوگ+<br>ۆک<br>ڕەگا چاوگ+ ا | لەرزۆک، گەڕۆک، برۆک<br>زانا، توانا، دانا<br>مردی، خەفتی، تۆپی |

| | |
|---|---|
| ڕەگا چاوگ+ی | |
| هەڤالکردار<br>+ەکی<br>هەڤالکردار+وو<br>هەڤالکردار+ین | سەرەکی، پێشەکی، پاشەکی، بنەکی، لاوەکی<br>سەروو، خواروو، پێشوو،<br>بەرین، پێشین، پاشین |

### ٢.٣.٤.٢ هەڤالناڤێن لێکدراو

| جۆرێن لێکدراو | نموونە |
|---|---|
| ناڤ+ناڤ | گەردن بلوور، بالا نەمام، بەژن زراڤ، گرانبەها |
| ناڤ+بە+ناڤ | قوڕبەسەر، هەڕی بەسەر |
| ناڤ- ڕەگا کردار | ئاشتی خواز، سەربەست، دەستبڕ، دەمشڕ، |
| دووپات کردنا ناڤ | کون کون، خال خال |
| ناڤ+ هەڤالناڤ | سەرخۆش، سەر ڕووت، چاڤرەش، دلشاد، پێخواس |
| هەڤالناڤ+ناڤ | خۆش باوەڕ، خۆش مرۆڤ، خوەشزار، خوەشگۆ |
| هەڤالناڤ+ە + ناڤ | پیرەمێرد، کورتەبالا، تاریکەشەڤ، |
| هەڤالناڤ+ڕەگا چاوگ | دووربین، ڕەشپۆش، ڕاستگۆ، |
| ژمارە+ناڤ | دوودل، دووڕوو، یەک چاڤ |
| هەڤالکردار+ناڤ | ژێردەست، بندەست، ژێر چەپۆک |
| هەڤالکردار+ڕەگا چاوگ | کەمخۆر، فرەخۆر، کەم بلێ |
| دووپاتکردنا هەڤالناڤ | ورد ورد، جوان جوان، نەرم نەرم |

## ٢.٣.٥ هەڤالناڤ و پۆلە وشەێن دی

هەندەک جار هەڤالناڤ لە پۆلەوشەی هەڤالکردار و ناڤ نایەتە جوداکردن. لەوما جێگەی سەرسوڕمان نییە کو هەندەک نووسەر تێکەلی لە ناڤبەرا پۆلەوشەی "ناڤ، هەڤالناڤ و هەڤالکردار" بکەن، بۆ نموونە هەندەک جار یەک وشە لە ڕستە وەکو هەڤالکردار، ناڤ و هەڤالناڤ ئەرک دەبینیێ مینا:

جوان زیرەکە. ناڤ

نەسرین جوان-ە. هەڤالناڤ

نەسرین جوان دەڕوات. هەڤالکردار

## ٢.٣.٦ هەڤالناڤا بەراوردکاری

ئەڤ جۆرە هەڤالناڤە بەراورد لە نێوان دوو کەس، دوو تشت یان دوو کۆمەل دەکا:

| هەڤالناڤ | پلەی بەراورد+ تر | پلەی بالا+ ترین |
|---|---|---|
| ئازا | ئازاتر | ئازاترین |
| ترسنۆک | ترسنۆکتر | ترسنۆکترین |
| دڕندە | دڕندەتر | دڕندەترین |
| پیس | پیستر | پیسترین |
| پاک | پاکتر | پاکترین |
| جەسوور | جەسوورتر | جەسوورترین |
| شەڕەنگێز | شەڕەنگێزتر | شەڕەنگێزترین |
| غەمگین | غەمگینتر | غەمگینترین |
| هێژا | هێژاتر | هێژاترین |
| بەلەنگاز | بەلەنگازتر | بەلەنگاترین |

### ٢.٣.٧ دژەواتا

نها لەگەل هەندەک هەڤالناڤێن دژەواتا. هەلبەت هەندەک هەڤواتا لە خشتەی ژێرڤە دێنە دیتن.

| دژەواتا | دژەواتا | دژەواتا |
|---|---|---|
| توند >< سست | وشک >< تەڕ | ڕەق >< نەرم |
| ئازا >< ترسنۆک | زیر >< گێل/دەبەنگ | ڕژی >< چەور |
| باش >< خراپ | کەهی/مالی >< کێڤی | دلشاد >< غەمگین |
| بلند/بەرز >< نزم | کەڤن >< نویێ/تازە | شرین >< تال |
| برسی >< تێر | لاو/گەنج >< پیر | ترش >< تفت |
| جوان >< کرێت/ناشرین | مەزن/گەورە ><بچووک | ڤالا >< پڕ |
| خێرا >< هێواش<br>چەلەنگ >< لەسەرخۆ | قورس >< سڤک<br>گران >< هەرزان | تەنک/زراڤ >< ئەستوور<br>زراڤ/باریک >< پان |
| گەرم >< سارد | پاک >< پیس | تاریک >< ڕوون/ڕۆشنا |
| درێژ >< کورت | ڕاستگۆ >< درۆزن | هەژار >< دەولەمەند |
| دوور >< نزیک | ڕاست >< چەپ | زیندی >< مردی |
| فراوان >< تەنگ/تەسک | شاش >< دروست | گەهشتی >< کەرک |

## ٢.٤ هەڤالکردار

### ٢.٤.١ پێشەکی

هەڤالکردار بە ئاسانی نایەتە پێناسە کردن. هەڤالکردار دەتوانێ ئاماژە بە گەلەک جۆر ڕەوش بدا وەک[20]:

**دەم**: دوایی، زوو، ئێستا/نها، هەنووکە.

**چۆنیەتی**: هێدی، خێرا، لەسەرخۆ، چاک، خراپ، لە ناکاو/لە نشکاڤ، لە خۆڕا، لە هەڤڕا، بەهەڤڕا.

**شوون/شوێن**: ژوور، ژێر، بن، پاش، پێش.

**پلە**: زۆر، کێم، فرە، هێجگار، گەلەک.

**پەیوەندیی لۆجیکی**: چونکە، لەبەرئەوەی، بە ئەنقەست، داکو/بۆ ئەوەی.

**هەلوێست نیشاندان**: بەخۆشی><ناخۆشی، بەزەردەخەنە><بە خەمساردی، بە هەناسەساردی.

**دلنیایی**: هەلبەت، بێگومان

**دووبارەکردن**: دووبارە، دیسان، هەروەها.

**نەفی**: هەرگیز/تووجار، بە هیچ جۆرەک، بە هیچ شێوەیەک.

بە گشتی هەڤالکردار ئاماژە دەدا بە:

١. **کردار**: ئازاد زۆر دەخوا.

[20] بۆ هەڤالکردار ڤان چەمکان هاتییە بەکارهێنان: زەرف، ئاوەڵکردار، نیر و هۆکەر.

٢. **هەڤالناڤ**: ئازاد <u>زۆر</u> جوان دەخوا.

٣. **هەڤالکردار**: ئازاد <u>زۆر</u> بە خێرایی دەخوا.

## ٢.٤.٢ واتای هەڤالکردار

هەڤالکردار لە ڕوانگەی واتا دەکرێ بە دوو دەستە:

دەستەی یەکەم: هەڤالکردار دەربڕین لە واتای **کات/دەم، شوێن، شێوە، هۆکار، چەندایەتی و چۆنیەتی** دەکا. ئەڤ دەستەیە بەرسڤا پرسیارێن **کەنگێ، کوێ، لە کوێ، چۆن، بۆچی، چەند، تا چی ڕادەیەک** دەدا.

<u>**کات**</u>: ئەودەم، ئێستا، هەنووکە، دواتر، دوێنی، ئەمسال، هەمیشە/هەردەم، هەرگیز/تووجار، هتد.

<u>**شوون/شوێن**</u>: ئێرە، ئەوێ، لە ماڵ، دەرەڤە، ژوورەڤە.

<u>**شێوە**</u>: خێرا، هێدی، باش، بەژێری، لەسەرخۆ، یەکسەر، هەرڕۆژ، دەست بەجێ، بە یەکجاری هتد.

<u>**هۆکار**</u>: بۆیە/لەوما/لەوڕا، چونکە، لەبەرئەوە، داکو، بە ئەنقەست، ئەگینا (ئەگەر نا) هتد.

<u>**چەندایەتی**</u>: زۆر، فرە، گەلەک، بە یەکجار، پڕ، پیچەک، نەختەک، تۆزەک، بەس، هتد.

<u>**چۆنیەتی**</u>: پێکڤە، مەردانە، مندالانە، دەبەنگانە، ژیرانە، جەسوورانە هتد.

دەستەی دووهەم: ئەڤ جۆرە هەڤالکردارە وابەستەی هەموو ئەو ڕستەیە دەبن کو هەڤاکردارەکە تێی کەفتییە، وەک:

**هەڤالکردارا نەفی:** بە دەگمەن، هەرگیز/توجار، بە هیچ جۆرەک.

**هەڤالکردارا هەلوێست هەلگر:** بێ گومان، بە دڵنیایی، نە خاسمە، نمازە، هەلبەت، لەوانەیە، ئاساییانە، مخابن هتد.

**هەڤالکردارا گرێدانا تێکستی:** هەروەها، بە ئەڤ شێوەیە/بە ڤی ئاڤایی، بە جۆرەکا دی، بە پێچەوانە/بەروڤاژ، هەرچۆنەک بێ/هەر چەوا بی، بێجگە لە ئەڤە/ئەوە، لە ڕاستیدا، لە هەمبەر/ بەرامبەردا، هەرچەندە، ئینجا، تەنانەت، بە لایەنی کێم، لە بەر ئەڤە/ئەوە، بڤێ و نەڤێ، بە کورتی، داکو، ئانکو، بۆ ئەوەی هتد.

## ٢.٤.٣ هەڤالکردارێن نوێ

لە زمانا کوردی هەڤالکردار دەکرێ **سادە** بێ مینا *خێرا، خراپ، چەپ، ڕاست، ژێر، ژوور*، **دارشتی** بێ لە ڕێگەی (پاشگر و پێشگر) مینا: *بێگومان، بەگوڕ، بە لەز، بەتەنیا، ئێڤاران* یان **لێکدراو** بێ لە ڕێگەی دوو وشە وەک: *پۆل پۆل، هێدی هێدی، ڕۆژبەڕۆژ، گورج و گۆڵ، تێروپڕ*.

### ٢.٤.٣.١ هەڤالکردارێن دارشتی

**لە ڕێگەی پێشگر:** لە ڕاستیدا ڤان پێشگران ئامرازا پێشبەندن کو پێش هەڤالناڤ و هەڤالکردارێن دی دەکەڤن:

| پێشگر | نموونە |
|---|---|
| بێ | بێگومان، بێنان، بێنەوا، بێوچان |
| بە | بەپەلە، بەلەز، بەگوڕ، بەتەنێ، بەتەڤایی، بە ڕاستی، بە ڕێژەی، بە ئاراستەی/ بە ئالی |
| لە | لەبن، لەژێر، لەبان، لەکن، لەپێش، لەپاش، لە ناڤ، لە دەر، لە هنداڤ |

**لە ڕێگەی پاشگر:**

| نموونە | پاشگر |
|---|---|
| ئیڤارێ، سبەهێ، هاڤینێ، بەهارێ، خوارێ، سەرێ، ژێرێ، ژوورێ. | ناڤ + ێ |
| ئیڤاران، سبەینان، شەڤان، سالان، جاران، جەژنان، زستانان. | ناڤ + ان |
| مەردانە، ژیرانە، گێلانە، زارۆکانە، ژنانە، جەسوورانە. | ناڤ/هەڤالناڤ + انە |
| شێرئاسایی، ڕیڤی ئاسایی، تو ئاسایی، کوورئاسایی. | ناڤ/جێناڤ/هەڤالناڤ + ئاسایی |
| ڕۆژەک، سالەک، سبەینانەک، گەلەک، چەندەک، هەیڤەک | ناڤ/جێناڤ +ەک |
| پێشڤە، دەرڤە، پاشڤە، ژوورڤە | هەڤالکردار+ ڤە |

**پێشگر و پاشگر:** وشەی نێوان پێشگر و پاشگر دەکرێ ناڤ یان هەڤالناڤ بێ.

| نموونە | پێشگر +وشە +پاشگر |
|---|---|
| بێباکانە، بێشەرمانە، بێویژدانانە<br>بێنازی، بێئاڤی، بێشوێنی، بێمالی، بێپارەیی، بێویژدانی | بێ+ وشە+ انە<br>بێ+ وشە+ ی |
| بەژیری، بەخۆشی، بە چاکی، بەخراپی، بە ڕاستی، بەوشکی.<br>بەبرایەتی، بەدۆستایەتی، بەدوژمنایەتی، | بە +هەڤالناڤ+ ی<br>بە +ناڤ+یەتی<br>بە +ناڤ+ێتی |

| | |
|---|---|
| بە+هەڤالکردار+یی | بە دۆستێتی، بە خزمێتی، بەهەڤالێتی |
| لە/بە+جێناڤ+ڕا | بە تۆپزیی، بە پانیی، بە تاریکیی، بە هەژاریی، بە نازداریی. |
| لە+ هەڤالکردار+ڕا | لەهەڤڕا، بەهەڤڕا، لەخۆڕا، بەخۆڕا. |
| لە+ناڤ+ دا | لەپڕا (لە نشکافە) |
| لە+هەڤالکردار+ڤە | لە ڕاستیدا، لە تەنگیدا، لە بەرنگاریدا، لە زۆریدا/پڕانیدا<br>لە دەرڤە، لە پێشڤە، لە ژێرڤە، لە ژوورڤە، |

### ٢.٤.٣.٢ هەڤالکردارێن لێکدراو

لە دووبارەبوونا یان گرێدانا دوو وشە (ناڤ، ژمارە، هەڤالناڤ، هەڤالکردار) دێتە دروست کردن:

| جۆرا لێکدان | نموونە |
|---|---|
| **دووبارەکردن**<br>ناڤ+ناڤ<br>ژمارە+ژمارە<br>هەڤالناڤ+ هەڤالناڤ<br>هەڤالکردار<br>+هەڤالکردار | پۆل پۆل، دەستە دەستە، تۆرە تۆرە، جارجار، تووجار<br>یەک یەک، دوودوو، دەدە، بیست بیست<br>جوان جوان، نەرم نەرم، بەرز بەرز، نزم نزم<br>کێم کێم، هێدی هێدی، زووزوو، خێرا خێرا، تاو تاو |
| ناڤ+او+ناڤ | پشتاوپشت، دولاودول، شاخ و شاخ |
| ناڤ+ەو+ناڤ | شاخەوشاخ، بانەوبان، شانەوشان |
| ناڤ+بە+ناڤ | ڕۆژبەڕۆژ، شەڤبەشەڤ، چیا بە چیا، سال بە سال |
| ناڤ+لە+ناڤ | یەک لە دوو، دەست لە دەست، شان لە شان، دل |

| | |
|---|---|
| | له دل |
| ـەڤلناف+بە+ناف | پرپەدڵ، پرپەدەم، پڕ بە گیان |
| ژ...ره<br>-ـ ڤ/هەڤالکردار | یەکسەر، یەکجار، یەکشەم، دواجار، نیڤشەڤ، نیڤرۆ، دووسبە |
| هەر +<br>ـ ڤ/ژمارە/هەڤالکردار | هەرشەڤ، هەررۆژ، هەردەم، هەریەک، هەرچار، هەرگاڤ، هەرکات، هەرسال |
| هەڤالکردار + و +<br>هەڤالکردار +<br>هەڤالکردار | تێرویڕ، زۆروکێم، گورجوگۆل، پانوپۆڕ، بەری نها، کێمجار |
| ناف+ا+دی | هەیڤا دی، سالا دی، شەڤا دی |
| دەستەڤاژە | بە خۆش بێ یان ناخۆشی، بە هیچ ڕەنگێ/جۆرێ، بە دوژمنایەتی یان دۆستایەتی، بڤێ و نەڤێ، بە لەز و بەز |

# ٢.٥ کردار

## ٢.٥.١ واتا و ئەرک

### ٢.٥.١.١ کردارێن سەرەکی

چەمکەکا گشتی بۆ ئەو تشتەی کو کردارا سەرەکی ئاماژەی بۆ بکا کردەوە – یە (ڕەوش، ڕووداو/بوەیەر و پرۆسە). لە کردەوە (مرۆڤ، ئاژەل، دەزگا، کەرەستە، ئامێر و تشتێن دی) پشکدارە[٢١].

بە گشتی کردار ئاماژە بە سێ بژارە دەکا:

١. **ڕەوش** وەک: هەبوون و گرتن[٢٢]. ئازاد دوو خانی هەیە. مرۆڤ ڕێز لە زانست دەگرێ. ئاڤا ئەوێ نازدارە.

٢. **ڕووداو/بوەیەر** وەک: مردن، کەفتن، ڕەڤین. ئازاد مرد. نەوزاد کەفت. نێرگز ڕەڤی.

٣. **پرۆسە** وەک: نووسین، کڕین، ڤەشارتن. ئازاد کارا خۆ کرد. نەوزاد خانی کڕی. من نامەکە ڤەشارت.

---

21 بۆ کردار ڤان چەمکان هاتییە بەکارهێنان: فیعل، کار، کرن، کردێر، پشک و فێل. بنەڕە ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی (٢٠١١:٨٠).

22 ڤان کرداران لە فۆرما چاوگ هاتیە نیشاندان؛ بنەڕە لاپەڕەی پاشتر.

سنوورا نێوان ئەڤ سێ بژارەیە نایەتە دیاریکردن چونکە هەمان کردار دەکرێ ئاماژە بە ڕەوش، پرۆسە و ڕووداو بدا. بۆ نموونە کردارا دەرچوون لە ئەڤ ڕستە دەکرێ ئاماژە بە پرۆسە و ڕووداو بدا: ئازاد لە خولا شۆفێری دەرچوو.

## ٢.٥.١.٢ مەیدانا واتا

کردەوە کو کردار ئاماژەی بۆ دەکا دەکرێ بۆ سێ مەیدان بێتە دابەشکردن:

١. **مەیدانا جەستەیی:** هەبوون (ژیان، وەستان، دانیشتن)، جولە (ناردن، هاتن، هێنان)، بەرهەمهێنان (نانکردن، پالافتن، دروون)، بەکاربردن (خواردن، دڕاندن، ڤەخواردن)، کارا جەستەیی دی (قرتاندن، گەستن، وێنەکێشان، کۆکین، هەرسکردن). لە ئەڤ مەیدانە **کردەوە** لە لایەن هەست دێتە درک پێکردن: دیتن، بیستن، هەستپێکردن، بۆنکردن، تامکردن.

٢. **مەیدانا جەستەیی و جڤاکی:** دەرککردن (دیتن، بیستن، تامکردن)، پەیوەندی (داواکردن، پێشنیارکردن، ئاماژەکردن، نووسین)، یادگاری و هزر (تێگەیشتن، لەبیرکردن، باوەڕهێنان، گومانکردن، زانین)، هەلوێست (پلاندانان، هەولدان، جەختکردن)، توانا (توانین، بەرگەگرتن، بەردەوامبوون)، کردەوە و پەیوەندیی جڤاکی (یارمەتیدان، ژن هێنان، شووکردن، جودابوون، بە تەنگ بوون). لە ئەڤ مەیدانە **کردەوە** دەربارەی چالاکی مەژی و بەسەربردن – ە.

٣. **مەیدانا لۆجیکی:** هۆ و کاریگەری (پەیوەست بوون، بوون بە هۆکارا، هێنانە دی، چێبوون)، لێکچوون (بەراوردکردن، لە هەمبەرکردن. لێکچوون)، ئاماژدان (ئاماژەکردن، نوێنەرایەتی کردن، دەستنیشانکردن)، هەبوون

(هەبوون، گومبوون، دەرکەفتن، پەیدابوون)، جلۆنایەتی ( کێمبوون، پتربوون، بەرینکردن، کێشان)، خودانداری (کڕین، فرۆشتن، بەخشین، پەیداکردن)، بەش — فرە بەش (پێکهاتن لە، دابەشکردن، کۆمکردن). لە ئەڤ مەیدانە کردەوە دەربارەی پەیوەندیی نابەرجەستەیە کو بە چەندین جۆر دێتە نیشاندان.

## ٢.٥.١.٣ رۆلا کردار

لە هەندەک کردار بکەر نییە؛ واتە هیچ کەس لە کردەوە پشکدار نەبووە. بۆ نموونە باران بارین. خۆر هەلهاتن. خۆر ئاڤابوون. گەلا وەرین. بە ڤان کرداران دەگوترێ کردارا ناکەسی. هەلبەت چاوگا "بارین، هەلهاتن، ئاڤابوون" وەک کەسا سێی تاک دێتە ئاماژەپێدان لێ "وەرین" ئاساییانە وەک کەسا سێی کۆ. چاوگێن دی مینا "وەرین، بارین، قوقان هتد." زیاتر لەگەل ئاژەل پەیوەستە، واتە لەگەل کەسا سێ بۆ هەردوو تاک و کۆ.

هەندک جۆر لە کردارێن دی وەک چاوگێن تێنەپەڕ "برژاندن، خنکاندن، ڕژاندن، ڕووخاندن، سووتاندن، کولاندن و لەوەڕاندن" هەیە کو هۆکارا یان کەسا پاش کردەوەکە نادیارە. ڤان کرداران تێنەپەڕن و بکەرێن ڕاستەقینەی پاش کردەوەکان نادیارن. گۆشتەکە دێتە/هاتە برژاندن. ئاڤەکە دێتە/هاتە ڕژاندن. پەزەکان دێنە/هاتنە لەوەڕاندن. کێ و چۆن کردەوەکان هاتیە ئەنجامدان نادیارە. هەرچەندە "گۆشتەکە، ئاڤەکە، پەزەکان" رۆلا بکەر لە ڕستە دەبینین بەلام لە ڕاستیدا ڤان وشان وەک بەرکار بەر کرەدەوەی بکەرەک کەفتنە. لە بنەڕەتدا ڤان کرداران ناچالاکن[٢٣].

---

[23] لە ک.خ. ڤان ڕستان بە ئەڤ جۆرە دێنە گوتن: گۆشتەکە برژا. مندالەکە خنکا. ئاڤەکە ڕژا. پەزەکان لەوەڕان. بە مەبەستا ئاسانکردنا ڕێسای ڕێزمان من شێوازا ک.خ. بە پەسەند نازانم بۆ زمانا فەرمی. بنەڕە ٢.٥.٧ کردارێن دیار و کردارێن نادیار.

دیسان هەندەک جۆر لە چاوگێن/کردارێن دی هەیە مینا "ئاوسان، ئێشان، ئالۆزکان، ژاکان و تلۆقان، کولان" تێنەپەڕن لێ ڤان کرداران دەستنیشانا پارچەیەک لە ئەنداما لەشا مرۆڤ یان ئاژەل دەکەن کو دەکەفنە ژێر کاریگەری کردەوەیەک. واتە پارچەیەک کو وابەستەی پارچەیەکا دییە:

| لە ڕستەی چالاک | لە ڕستەی ناچالاک |
|---|---|
| من برینا دەستا تو کولاند/ئاوساند. | برینا دەستا من دێنە/هاتە کولاندن/ئاوساندن. |
| تو پرچا سەرا ئەوێ ئالوزکاند/ ژاکاند. | پرچا سەرا ئەوێ دێنە/هاتە ئالۆزکاندن/ ژاکاندن. |
| ئەوی سەرا من ئێشاند. | سەرا من دێتە/هاتە ئێشاندن. |

بە کورتی لە پڕانی کردارەکان مرۆڤ چاوەڕێ دەکا کو پشکداربوویەک یان پتر لە کردەوەیەک پشکدار بێ. بۆ نموونە لە کردارا خواردن مرۆڤ چاوەڕوان دەکا کو پشکداربوویەک کردەوەیەک ئەنجام بدا: من نان خوارد. دیسان لە کردارا وێنە کێشان مرۆڤ چاوەڕوان دەکا کو کەسەک وێنەی تشتەک بکێشێ. لە ڤان کرداران مرۆڤ چاوەڕوان دەکا پشکداربووی وەک (مرۆڤ، ئاژەل، دەزگا، ئامێر و کەرەستە) لە واتای کردار هەبێ. بە ئەو ڕۆلە کو پشکداربوو لە ڤان کرداران هەیەتی دەگوترێ ڕۆلا وابەستە. ڕۆلێن گرنگا وابەستەی پشکداربوو لەگەل کردار دەکرێ لە چار خالا گرنگ بێتە دەست نیشان کردن:

- ئەو کەسەی کو کردەوە دەکا: کاوە گوتار دەبێژێ. گوتار دێتە گوتن.
- ئەو تشتە/کەسەی کو بەر کردەوە دەکەفێ: ئەوی سەگەکە دەبەستێ. دایک زارۆکا خۆ هەلدەگرێ. مامۆستا وانە بە خوێنکاران دەبێژێ. خوێنکاران وانە دەخوێنن.

- دەرئەنجاما کردەوە: ئەوێ ڕۆمان دەنووسێ. شیلان کراس دەدوورێ.
- ئەو کەسەی کو پەیوەنددارە لە کردەوە: ئەوان کۆمپیوتەرەک بۆ نەرمین کڕی. کۆمپیتەرەک بۆ نەرمین هاتە کڕین لە لایەن ئەوان ڤە.

لە خالا یەکەم و ڕستەی یەکەم ڕۆلا پشکداربووان وەک "بکەر و بەرکار" لە ڕستە دیارە. لە رستەی گوتار دێتە گوتن "دێتە گوتن" کردەوەیەک نییە کو "گوتار" وەک بکەر دەیکا، بەلکو "گوتار" بە خۆ بەرهەما کردەوەیە. لە ڕوانگەی ڕستە "گوتار" بکەرە بەلام لە ڕاستیدا "بەرکار"ە. لە رستەی "کۆمپیتەرەک بۆ نەرمین هاتە کڕین لە لایەن ئەوان ڤە" کۆمپیوتەر کردەوە ئەنجام نادا بەلکو ئەو بە خۆ کردەوە بەسەر هاتیە ئەنجامدان. ئێمە بە ڕۆلا پشکداربوو لە ڤان ڕستان دەبێژین **ڕۆلا وابەستە** (بە کردار)، واتە کردار لە لایەن بکەر نەهاتییە ئەنجامدان بەلکو بکەر بە خۆژی لە ژێر کاریگەریی کردارە.

لە هەمبەر ڕۆلا وابەستە، **ڕۆلا ئازاد** هەیە کو ئامارە بە دەم، جێگا و کەرەستە دەدا: کاوە لە مال پارە بە زارۆکان دا. ئەوێ تەلەفیزیۆنەکە بە پارچەیەک قوماش پاک کرد. نها من پاسکیلەک دەکڕم. لە کردارێن "دان، پاککردن و کڕین" دەبێ بکەر هەبێ کو تشتەک بەسەر کەسەک یان تشتەکا دی ئەنجام دەدا. بە کورتی هەندەک کرادر بکەر و بەرکار دەخوازێ. هەندەک ڕستە بۆ دەست نیشانکردنا دەما کردار هەڤالکردار دەخوازێ. ئێمە پاشتر هێدی هێدی باس لە ڤان بابەتان دەکەین (بنەڕە پشکا سێهەم).

## ٢.٥.٢ کردارێن تێپەڕ و کردارێن تێنەپەڕ

کردار، لە سەر بناغەی بوونیادا ڕستە "سینتاکس"، بۆ کردارا تێپەڕ و کردارا تێنەپەڕ دێتە دابەشکردن. کردارا تێپەڕ لە ڕستە پێویستی/پێدڤی بە بەرکار هەیە، لێ کردارا تێنەپەڕ لە ڕستە پێویستی بە بەرکار نییە.

**کردارێن تێپەڕ لە ڕستە وەک:** ئازاد تۆپەکە فڕێدا، ژیان نان دەخوات، جووتیار زەوی دەکێلێ. من دارەکە ناشت.

**کردارێن تێنەپەڕ لە ڕستە وەک:** ئازاد مرد، نازدار گریا، خانییەکە سووتا، زارۆکەکە نووست.

کردار هەیە کو دوو بەرکار لە ڕستە دەخوازێ بۆ نموونە:

ئازاد دیارییەک بە شیلان پێشکەش کرد.

ڕێڤەبەر دیاریی قوتابخانە بە شەونم دا.

دایک شیر بە زارۆکا خۆ دەدا.

ئازاد پارە بە برای خۆ دا.

من گولەک بە ئەوێ دا

## ٢.٥.٣ دەم و ڕێژەێن کردار

مرۆڤ بە گشتی باس لە دوو دەم دەکا: دەما بوری و دەما نها. ئێمە دەزانین کو کردارێن کوردی بۆ تێپەڕ و تێنەپەڕ دێنە دابەشکردن و جیێدڤا لکاو لە گۆڕ

کەسێن تاک/کۆ-ی یەک، دوو و سێ لەگەل کردار دێنە لکاندن. دیسان لە زمانا کوردی مرۆڤ باس لە سێ ڕێژەی کردار دەکا.

١. ڕێژەی ڕاگەیاندن: لە ئەڤ ڕێژەیە کردار ڕوودانا کردەوە نیشان دەدا کو لە لایەن کەسەک/تشتەک یان پتر هاتیە ئەنجام دان.
٢. ڕێژەی دانان: ئەڤ ڕێژەی کردارە باس لە ڕووداوەک/بویەرەک ناکا کو هاتیە یان دێتە ئەنجامدان لە لایەن کەسەک/تشتەک یان پتر، بەلکو کردار دەکەفێتە نێو ڕستەی خۆزگەیی و ئەگەری.
٣. ڕێژەی داخوازی: ئەڤ ڕێژەیە پەیوەستە بە فەرماندان؛ کەسا یەکەم داوا لە کەسا دووەما تاک/کۆ دەکا کو کردەوەیەک ئەنجام بدا/بدەن.

ئێمە یەکەم جار باس لە ڕێژەی کردارێن ڕاگەیاندن دەکەین، پاشتر دانان و داخوازی. هەرچۆنەک بێ ئێمە دەبێ یەکەم جار باس لە چاوگ بکەین چونکە چاوگ بۆ کردار بناغەیە.

## ٢.٥.٣.١ چاوگ

ئێمە گریمانە دەکەین کو هەموو کردارێن زمانا کوردی لە چاوگ دێنە وەرگرتن[٢٤]. چاوگ وەک کردەوە ئامارە بە ڕوودانەک/بویەرەک، ڕەوشەک یان پرۆسەیەک دەدا. هەموو چاوگ – ێن کوردی بە دەنگا /ن/ یان /ی°ن/، واتە /n/ یان /in/ کۆتایی دێ. ئەگەر چاوگەک بە دەنگا {نەبزوێن + /ن/} کۆتایی بێ ئەوا کۆتایی

[24] دیار نییە کو ئایا چاوگ سەرچاوەی کردارە یان کردار سەرچاوەی چاوگە (د. ئەوڕحمانی حەجی مارف – کردار- ٢٠٠٠:٢٠). لە چاوگ کردار، هەڤالناڤ و ناڤ دێتە دەرهێنان.

چاوگەکە بە دەنگا /یٖن/ /in/ دوماهی دێ بەلام ئەگەر چاوگەک بە دەنگا {بزوێن + /ن/} کۆتایی بێ ئەوا کۆتایی چاوگەکە بە دەنگا /ن/ /n/ دوماهی دێ. لە پێش دەنگا نونا چاوگ، واتە لە پێش دەنگا /ن/ یان /یٖن/ یەکەک لە ئەم پێنج دەنگە دێ[25]:

١. دەنگا /ا/.
٢. دەنگا /ی/.
٣. دەنگا /وو/.
٤. دەنگا /ت/.
٥. دەنگا /د/.

ئێمە چاوگێن زمانا کوردی بەپێی/لەگۆڕ ئەڤ پێنج دەنگە و بەپێی تێپەڕ و تێنەپەڕ دابەش دەکەین. ئێمە لە ئێرە ڕەگ و قەدا چاوگ بەپێی خشتە و بەپێی دەما بووری و نها بۆ ڕێژەی ڕاگەیاندن، دانان و داخوازی نیشان دەدەین.

## ٢.٥.٣.٢ ڕێژەی ڕاگەیاندن

### ٢.٥.٣.٢.١ دەما بووری

دەما بوری پێکهاتییە لە:

[25] چاوگ لە ڕستە وەک ناڤ دێتە بەکاهێنان و فۆڕما تاک/کۆ و دیار نادیار وەردەگرێ. دیسان چاوگ بۆ دروستکردنا گەلەگ ناڤ، کردار، هەڤالناڤ و هەڤالکردار دێتە بەکاهێنان.

**ڕابردووی نزیک**: کردار پێش دەما گوتن هاتییە ڕوودان.

**ڕابردووی بەردەوام**: پێش دەما گوتن یان کردنا کردارەک، کردارەکی دی بەردەوام هەبووە.

**ڕابردووی دوور**: لە ئێرە دوو کردار هەیە. یەکەم کردار پێش ڕوودانا کردارا دووەم چێ بووە/تەواو بووە. کردارا یەکەم ڕابرووردی تەواوە و کردارا دووەم ڕابردووی نزیکە.

**ڕابردووی تەواو**: کردار کۆتایی هاتییە.

## ۲.۵.۳.۲.۱.۱ چاوگێن تێنەپەڕ

| دەمێن بوری | قەدا چاوگ | جێناڤا لکاو بۆ کەسا | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | ۱ تاک | ۲ تاک | ۳ تاک | ۱ کۆ | ۲، ۳ کۆ |
| ڕابردووی نزیک | | م | ی | – | ین | ن |
| ڕابردووی بەردەوام | | دە+م | دە+ی | دە | دە+ین | دە+ین |
| ڕابردووی دوور | | بوو+م | بوو+ی | بوو | بوو+ین | بوو+ن |
| ڕابردووی تەواو | | م+ ە | ی- تە | یە | ین+ ە | ن+ە |

هەنووکە لەگەل هەندەک ڕستە بۆ چاوگێن تێنەپەڕ:

**ڕابردووی نزیک** مینا: ئەز/من چووم. تو چووی. ئەوی چوو. ئێمە چووین. (هوون)ئێوە/ئەوان چوون.

**ڕابردووی بەردەوام** مینا: گاڤا تو هاتی، من دەکەنیم/ ئەوان دەکەنین/ ئێمە دەکەنین/ هوون/ئێوە دەکەنین.

**ڕابردووی دوور** مینا: پێش گەیشتنا ئازاد، من ڕەڤی<u>بووم</u>/ تو ڕەڤی<u>بووی</u>/ ئەوی ڕەڤی<u>بوو</u>/ ئێمە ڕەڤی<u>بووین</u>/ ئێوە/ئەوان ڕەڤی<u>بوون</u>.

**ڕابردووی تەواو** مینا: من هات<u>مە</u>. تو هات<u>یە</u>. ئەوێ هاتیە. ئێمە هات<u>ینە</u>. هوون، ئێوە/ئەوان هات<u>نە</u>.

## ٢.٥.٣.٢.١.١.١ کۆمەلا /ان/

**ڕابردووی نزیک: قەدا چاوگ+ جێناڤا لکاو**

| چاوگ | قەدا چاوگ | جێناڤا لکاو بۆ کەسا | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | تاک | | | کۆ | |
| | | ١<br>قەد+ م | ٢<br>قەد+ ی | ٣<br>قەد | ١<br>قەد+ین | ٢ ، ٣<br>قەد+ ن |
| تۆران | تۆرا | تۆرام | تۆرای | تۆرا | تۆراین | تۆران |
| خنکان | خنکا | خنکام | خنکای | خنکا | خنکاین | خنکان |
| ڕازان | ڕازا | ڕازام | ڕازای | ڕازا | ڕازاین | ڕازان |
| ڕووخان | ڕووخا | ڕووخام | ڕووخای | ڕووخا | ڕووخاین | ڕووخان |
| شێوان | شێوا | شێوام | شێوای | شێوا | شێواین | شێوان |
| گەڕان | گەڕا | گەڕام | گەڕای | گەڕا | گەڕاین | گەڕان |
| گلان | گلا | گلام | گلای | گلا | گلاین | گلان |
| شکان | شکا | شکام | شکای | شکا | شکاین | شکان |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| دڕان | دڕا | دڕام | دڕای | دڕا | دڕاین | دڕان |
| ترسان | ترسا | ترسام | ترسای | ترسا | ترساین | ترسان |
| وەستان | وەستا | وەستام | وەستای | وەستا | وەستاین | وەستان |
| سووتان | سووتا | سووتام | سووتای | سووتا | سووتاین | سووتان |
| گریان | گریا | گریام | گریای | گریا | گریاین | گریان |
| مان | ما | مام | مای | ما | ماین | مان |

**ڕابردووی بەردەوام: دە+ قەد+ جێناڤا لکاو**

| چاوگ | قەدا چاوگ | جێناڤا لکاو بۆ کەسا | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | تاک | | | کۆ | |
| | | ١<br>دە +قەد<br>+م | ٢<br>دە +قەد<br>+ی | ٣<br>دە +<br>قەد | ١<br>دە +قەد<br>+ین | ٢ ، ٣<br>دە +قەد<br>+ ن |
| تۆران | تۆرا | دەتۆرام | دەتۆرای | دەتۆرا | دەتۆراین | دەتۆران |
| خنکان | خنکا | دەخنکام | دەخنکای | دەخنکا | دەخنکاین | دەخنکان |
| ڕازان | ڕازا | دەڕازام | دەڕازای | دەڕازا | دەڕازاین | دەڕازان |
| ڕووخان | ڕووخا | دەڕووخام | دەڕووخای | دەڕووخا | دەڕووخاین | دەڕووخان |
| شێوان | شێوا | دەشێوام | دەشێوای | دەشێوا | دەشێواین | دەشێوان |
| گەڕان | گەڕا | دەگەڕام | دەگەڕای | دەگەڕا | دەگەڕاین | دەگەڕان |
| گلان | گلا | دەگلام | دەگلای | دەگلا | دەگلاین | دەگلان |
| شکان | شکا | دەشکام | دەشکای | دەشکا | دەشکاین | دەشکان |
| دڕان | دڕا | دەدڕام | دەدڕای | دەدڕا | دەدڕاین | دەدڕان |
| ترسان | ترسا | دەترسام | دەترسای | دەترسا | دەترساین | دەترسان |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| وەستان | وەستا | دەوەستام | دەوەستای | دەوەستا | دەوەستاین | دەوەستان |
| سووتان | سووتا | دەسووتام | دەسووتای | دەسووتا | دەسووتاین | دەسووتان |
| گریان | گریا | دەگریام | دەگریای | دەگریا | دەگریاین | دەگریان |
| مان | ما | دەمام | دەمای | دەما | دەماین | دەمان |

ڕابردووی دوور: قەدا چاوگ + بوو+ (جێناڤا لکاو).

| چاوگ | قەدا چاوگ | جێناڤا لکاو بۆ کەسا | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | تاک | | | کۆ | |
| | | ١<br>قەد+بوو+م | ٢<br>قەد+بوو+ی | ٣<br>قەد+بوو | ١<br>قەد+بوو+ین | ٢، ٣<br>قەد+بوو+ن |
| تۆران | تۆرا | تۆرابووم | تۆرابووی | تۆرابوو | تۆرابووین | تۆرابوون |
| خنکان | خنکا | خنکابووم | خنکابووی | خنکابوو | خنکابووین | خنکابوون |
| ڕازان | ڕازا | ڕازابووم | ڕازابووی | ڕازابوو | ڕازابووین | ڕازابوون |
| ڕووخان | ڕووخا | ڕووخابووم | ڕووخابووی | ڕووخابوو | ڕووخابووین | ڕووخابوون |
| شێوان | شێوا | شێوابووم | شێوابووی | شێوابوو | شێوابووین | شێوابوون |
| گەڕان | گەڕا | گەڕابووم | گەڕابووی | گەڕابوو | گەڕابووین | گەڕابوون |
| گلان | گلا | گلابووم | گلابووی | گلابوو | گلابووین | گلابوون |
| شکان | شکا | شکابووم | شکابووی | شکابوو | شکابووین | شکابون |
| دڕان | دڕا | دڕابووم | دڕابووی | دڕابوو | دڕابووین | دڕابوون |
| ترسان | ترسا | ترسابووم | ترسابووی | ترسابوو | ترسابوین | ترسابوون |
| وەستان | وەستا | وەستابووم | وەستابووی | وەستابوو | وەستابووین | وەستابوون |
| سووتان | سووتا | سووتابووم | سووتابووی | سووتابوو | سووتابووین | سووتابوون |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| گریان<br>مان | گریا<br>ما | گریابووم<br>مابووم | گریابووی<br>مابووی | گریابوو<br>مابوو | گریابووین<br>مابووین | گریابوون<br>مابوون |

**ڕابردووی تەواو: قەد+ جێناڤا لکاو + (ە)**

| چاوگ | قەدا چاوگ | جێناڤا لکاو بۆ کەسا | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | تاک | | | کۆ | |
| | | ١<br>قەد+م<br>+ە | ٢<br>قەد+ی<br>+تە | ٣<br>قەد+یە | ١<br>قەد+ین<br>+ە | ٢ ، ٣<br>قەد+ن<br>+ە |
| تۆران | تۆرا | تۆرامە | تۆرایتە | تۆرایە | تۆراینە | تۆرانە |
| خنكان | خنكا | خنكامە | خنكایتە | خنكایە | خنكاینە | خنكانە |
| ڕازان | ڕازا | ڕازامە | ڕازایتە | ڕازایە | ڕازاینە | ڕازانە |
| ڕووخان | ڕووخا | ڕووخامە | ڕووخایتە | ڕووخایە | ڕووخاینە | ڕووخانە |
| شێوان | شێوا | شێوامە | شێوایتە | شێوایە | شێواینە | شێوانە |
| گەڕان | گەڕا | گەڕامە | گەڕایتە | گەڕایە | گەڕاینە | گەڕانە |
| گلان | گلا | گلامە | گلایتە | گلایە | گلاینە | گلانە |
| شكان | شكا | شكامە | شكایتە | شكایە | شكاینە | شكانە |
| دڕان | دڕا | دڕامە | دڕایتە | دڕایە | دڕاینە | دڕانە |
| ترسان | ترسا | ترسامە | ترسایتە | ترسایە | ترساینە | ترسانە |
| وەستان | وەستا | وەستامە | وەستایتە | وەستایە | وەستاینە | وەستانە |
| سووتان | سووتا | سووتامە | سووتایتە | سووتایە | سووتاینە | سووتانە |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| گریان | گریا | گریامە | گریایتە | گریایە | گریاینە | گریانە |
| مان | ما | مامە | مایتە | مایە | ماینە | مانە |

## ٢.٥.٣.٢.١.١.٢ کۆمەلا /ین/

**ڕابردووی نزیک: قەدا چاوگ + جێناڤا لکاو**

| چاوگ | قەدا چاوگ | جێناڤا لکاو بۆ کەسا | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | تاک | | | کۆ |
| | | ١<br>قەد+ م | ٢<br>قەد | ٣<br>قەد | ١، ٢، ٣<br>قەد+ن |
| بەزین | بەزی | بەزیم | بەزی | بەزی | بەزین |
| پەیڤین | پەیڤی | پەیڤیم | پەیڤی | پەیڤی | پەیڤین |
| پەڕین | پەڕی | پەڕیم | پەڕی | پەڕی | پەڕین |
| تەزین | تەزی | تەزیم | تەزی | تەزی | تەزین |
| تەقین/ | تەقی/ | تەقیم/ | تەقی/ | تەقی/ | تەقین/ |
| پەقین | پەقی | پەقیم | پەقی | پەقی | پەقین |
| تۆقین | تۆقی | تۆقیم | تۆقی | تۆقی | تۆقین |
| خزین | خزی | خزیم | خزی | خزی | خزین |
| خەنین/ | خەنی/ | خەنین/ | خەنی/ | خەنی/ | خەنین/ |
| کەنین | کەنی | کەنین | کەنی | کەنی | کەنین |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ڕۆیین | ڕۆی | ڕۆیم | ڕۆی | ڕۆی | ڕۆیین |
| چەقین | چەقی | چەقیم | چەقی | چەقی | چەقین |
| ڕوانین/ | ڕوانی/ | ڕوانیم/ | ڕوانی/ | ڕوانی/ | ڕوانین/ |
| نەڕین | نەڕی | نەڕیم | نەڕی | نەڕی | نەڕین |
| لەقین | لەقی | لەقیم | لەقی | لەقی | لەقین |
| کۆکین | کۆکی | کۆکیم | کۆکی | کۆکی | کۆکین |
| گەنین | گەنی | گەنیم | گەنی | گەنی | گەنین |
| نالین | نالی | نالیم | نالی | نالی | نالین |
| فڕین | فڕی | فڕیم | فڕی | فڕی | فڕین |
| زڤڕین | زڤڕی | زڤڕیم | زڤڕی | زڤڕی | زڤڕین |
| ڕەڤین | ڕەڤی | ڕەڤیم | ڕەڤی | ڕەڤی | ڕەڤین |

**ڕابردووی بەردەوام: دە+ قەدا چاوگ+ جێناڤا لکاو**

| چاوگ | قەدا چاوگ | جێناڤا لکاو بۆ کەسا | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | تاک | | | کۆ |
| | | ١ | ٢ | ٣ | ١، ٢، ٣ |
| | | دە +قەد +م | دە +قەد | دە +قەد | دە +قەد +ین |
| بەزین | بەزی | دەبەزیم | دەبەزی | دەبەزی | دەبەزین |
| پەیڤین | پەیڤی | دەپەیڤیم | دەپەیڤی | دەپەیڤی | دەپەیڤین |
| پەڕین | پەڕی | دەپەڕیم | دەپەڕی | دەپەڕی | دەپەڕین |
| تەزین | تەزی | دەتەزیم | دەتەزی | دەتەزی | دەتەزین |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| تەقین/ | تەقی/ | دەتەقیم/ | دەتەقی/ | دەتەقی/ | دەتەقین/ |
| پەقین | پەقی | دەپەقیم | دەپەقی | دەپەقی | دەپەقین |
| تۆقین | تۆقی | دەتۆقیم | دەتۆقی | دەتۆقی | دەتۆقین |
| خزین | خزی | دەخزیم | دەخزی | دەخزی | دەخزین |
| خەنین/ | خەنی/ | دەخەنین/ | دەخەنی/ | دەخەنی/ | دەخەنین/ |
| کەنین | کەنی | دەکەنین | دەکەنی | دەکەنی | دەکەنین |
| ڕۆیین | ڕۆی | دەڕۆیم | دەڕۆی | دەڕۆی | دەڕۆیین |
| چەقین | چەقی | دەچەقیم | دەچەقی | دەچەقی | دەچەقین |
| ڕوانین/ | ڕوانی/ | دەڕوانیم/ | دەڕوانی/ | دەڕوانی/ | دەڕوانین/ |
| نەڕین | نەڕی | دەنەڕیم | دەنەڕی | دەنەڕی | دەنەڕین |
| لەقین | لەقی | دەلەقیم | دەلەقی | دەلەقی | دەلەقین |
| کۆکین | کۆکی | دەکۆکیم | دەکۆکی | دەکۆکی | دەکۆکین |
| گەنین | گەنی | دەگەنیم | دەگەنی | دەگەنی | دەگەنین |
| نالین | نالی | دەنالیم | دەنالی | دەنالی | دەنالین |
| فڕین | فڕی | دەفڕیم | دەفڕی | دەفڕی | دەفڕین |
| زڤڕین | زڤڕی | دەزڤڕیم | دەزڤڕی | دەزڤڕی | دەزڤڕین |
| ڕەڤین | ڕەڤی | دەڕەڤیم | دەڕەڤی | دەڕەڤی | دەڕەڤین |

**ڕابردووی دوور: قەدا چاوگ+ بوو + جێناڤا لکاو**

| چاوگ | قەدا چاوگ | جێناڤا لکاو بۆ کەسا | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | تاک | | | کۆ | |
| | | ١<br>قەد+ بوو<br>+م | ٢<br>قەد+بوو<br>+ی | ٣<br>قەد+بوو | ١<br>قەد+بوو<br>+ین | ٢، ٣<br>قەد+بوو+<br>ن |
| بەزین | بەزی | بەزیبووم | بەزیبووی | بەزی بوو | بەزی بووین | بەزی بوون |
| پەیڤین | پەیڤی | پەیڤیبووم | پەیڤیبووی | پەیڤی بوو | پەیڤی بووین | پەیڤی بوون |
| پەڕین | پەڕی | پەڕیبووم | پەڕیبووی | پەڕی بوو | پەڕی بووین | پەڕی بوون |
| تەزین | تەزی | تەزیبووم | تەزیبووی | تەزی بوو | تەزی بووین | تەزی بوون |
| تەقین/ | تەقی/ | تەقیبووم | تەقیبووی | تەقی بوو/ | تەقی بووین/ | تەقی بوون |
| پەقین | پەقی | پەقیبووم | پەقیبووی | پەقی بوو | پەقی بووین | پەقی بوون |
| تۆقین | تۆقی | تۆقیبووم | تۆقیبووی | تۆقی بوو | تۆقی بووین | تۆقی بوون |
| خزین | خزی | خزیبووم | خزیبووی | خزی بوو | خزی بووین | خزی بوون |
| خەنین/ | خەنی | خەنیبوون | خەنیبووی | خەنی بوو | خەنی بووین | خەنی بوون |
| کەنین | کەنی | کەنیبوون | کەنیبووی | کەنی بوو | کەنی بووین | کەنی بوون |
| ڕۆیین | ڕۆی | ڕۆیبووم | ڕۆیبووی | ڕۆی بوو | ڕۆیی بووین | ڕۆیی بوون |
| چەقین | چەقی | چەقیبووم | چەقیبووی | چەقی بوو | چەقی بووین | چەقی بوون |
| نەڕین | نەڕی | نەڕیبووم | نەڕیبووی | نەڕی بوو | نەڕی بووین | نەڕی بوون |
| لەقین | لەقی | لەقیبووم | لەقیبووی | لەقی بوو | لەقی بووین | لەقی بوون |
| کۆکین | کۆکی | کۆکیبووم | کۆکیبووی | کۆکی بوو | کۆکی بووین | کۆکی بوون |
| گەنین | گەنی | گەنیبووم | گەنیبووی | گەنی بوو | گەنی بووین | گەنی بوون |
| نالین | نالی | نالیبووم | نالیبووی | نالی بوو | نالی بووین | نالی بوون |
| فڕین | فڕی | فڕیبووم | فڕیبووی | فڕی بوو | فڕی بووین | فڕی بوون |
| زڤڕین | زڤڕی | زڤڕیبووم | زڤڕیبووی | زڤڕی بوو | زڤڕی بووین | زڤڕی بوون |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ڕەڤین | ڕەڤی | ڕەڤیبووم | ڕەڤیبووی | ڕەڤی بوو | ڕەڤی بووین | ڕەڤی بوون |
| ئانین | ئانی | ئانیبووم | ئانیبووی | ئانی بوو | ئانی بووین | ئانی بوون |
| زاین | زای | زاییبوم | زاییبووی | زایی بوو | زایی بووین | زایی بوون |

ڕابردووی تەواو: قەدا چاوگ+ جێناڤا لکاو — (ە)

| چاوگ | قەدا چاوگ | جێناڤا لکاو بۆ کەسا | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | تاک | | | کۆ |
| | | ١<br>قەد+م+ە | ٢<br>قەد+تە | ٣<br>قەد+یە | ١، ٢، ٣<br>قەد+ن+ە |
| بەزین | بەزی | بەزیمە | بەزیتە | بەزییە | بەزینە |
| پەیڤین | پەیڤی | پەیڤیمە | پەیڤیتە | پەیڤییە | پەیڤینە |
| پەڕین | پەڕی | پەڕیمە | پەڕیتە | پەڕییە | پەڕینە |
| تەزین | تەزی | تەزیمە | تەزیتە | تەزییە | تەزینە |
| تەقین/ | تەقی/ | تەقیمە/ | تەقیتە/ | تەقییە/ | تەقینە/ |
| پەقین | پەقی | پەقیمە | پەقیتە | پەقییە | پەقینە |
| تۆقین | تۆقی | تۆقیمە | تۆقیتە | تۆقییە | تۆقینە |
| خزین | خزی | خزیمە | خزیتە | خزییە | خزینە |
| خەنین/ | خەنی/ | خەنیمە/ | خەنیتە/ | خەنییە/ | خەنینە/ |
| کەنین | کەنی | کەنیمە | کەنیتە | کەنییە | کەنینە |
| ڕۆیین | ڕۆی | ڕۆیمە | ڕۆیتە | ڕۆییە | ڕۆینە |
| چەقین | چەقی | چەقیمە | چەقیتە | چەقییە | چەقینە |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| نەڕین | نەڕی | نەڕیمە | نەڕیتە | نەڕییە | نەڕینە |
| لەقین | لەقی | لەقیمە | لەقیتە | لەقییە | لەقینە |
| کۆکین | کۆکی | کۆکیمە | کۆکیتە | کۆکییە | کۆکینە |
| گەنین | گەنی | گەنیمە | گەنیتە | گەنییە | گەنینە |
| نالین | نالی | نالیمە | نالیتە | نالییە | نالینە |
| فڕین | فڕی | فڕیمە | فڕیتە | فڕییە | فڕینە |
| زڤڕین | زڤڕی | زڤڕیمە | زڤڕیتە | زڤڕییە | زڤڕینە |
| ڕەڤین | ڕەڤی | ڕەڤیمە | ڕەڤیتە | ڕەڤییە | ڕەڤینە |

### ٢.٥.٣.٢.١.١.٣ کۆمەلا /وون/

ڕابردووی نزیک: قەدا چاوگ+ جێناڤا لکاو

| چاوگ | قەدا چاوگ | جێناڤا لکاو بۆ کەسا | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | تاک | | | کۆ | |
| | | ١<br>قەد+ م | ٢<br>قەد+ ی | ٣<br>قەد | ١<br>قەد+ین | ٢ ، ٣<br>قەد+ ن |
| بوون | بوو | بووم | بووی | بوو | بووین | بوون |
| چوون | چوو | چووم | چووی | چوو | چووین | چوون |

ڕابردووی بەردەوام: دە+ قەدا چاوگ+ جێناڤا لکاو

| چاوگ | قەدا چاوگ | جێناڤا لکاو بۆ کەسا | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | تاک | | | کۆ | |
| | | ١<br>دە+قەد+م | ٢<br>دە+قەد+ی | ٣<br>دە + قەد | ١<br>دە+قەد +ین | ٢ ، ٣<br>دە+قەد+ ن |
| بوون<br>چوون | بوو<br>چوو | دەبووم<br>دەچووم | دەبووی<br>دەچووی | دەبوو<br>دەچوو | دەبووین<br>دەچووین | دەبوون<br>دەچوون |

رابردووی دوور: قەدا چاوگ+ بوو+ جێناڤا لکاو

| چاوگ | قەدا چاوگ | جێناڤا لکاو بۆ کەسا | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | تاک | | | کۆ | |
| | | ١<br>قەد+بوو م | ٢<br>قەد+بوو ی | ٣<br>قەد+بوو | ١<br>قەد+بوو+ین | ٢ ، ٣<br>قەد+بوو ن |
| بوون<br>چوون | بوو<br>چوو | بوو بووم<br>چوو بووم | بوو بووی<br>چوو بووی | بوو بوو<br>چوو بوو | بوو بووین<br>چوو بووین | بوو بوون<br>چوو بوون |

رابردووی تەواو: قەدا چاوگ+ جێناڤا لکاو+ ە

| چاوگ | قەدا چاوگ | جێناڤا لکاو بۆ کەسا | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | تاک | | | کۆ | |
| | | ١ قەد+ م+ە | ٢ قەد+ ی+تە | ٣ قەد+یە | ١ قەد+ین+ە | ٢، ٣ قەد+ ن+ ە |
| بوون | بوو | بوومە | بوویتە | بوویە | بووینە | بوونە |
| چوون | چوو | چوومە | چوویتە | چوویە | چووینە | چوونە |

## ٢.٥.٣.٢.١.١.٤ کۆمەلا /تن/

قەدا چاوگ بە لابردنا دەنگا/تیپا /ن/ دێتە دروستکردن.

رابردووی نزیک: قەدا جاوگ+ جێناڤا لکاو

| چاوگ | قەدا چاوگ | جێناڤا لکاو بۆ کەسا | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | تاک | | | کۆ | |
| | | ١ قەد+ م | ٢ قەد+ ی | ٣ قەد | ١ قەد+ین | ٢، ٣ قەد+ ن |
| ئاخافتن | ئاخافت | ئاخافتم | ئاخافتی | ئاخافت | ئاخافتین | ئاخافتن |
| بزووتن | بزووت | بزووتم | بزووتی | بزووت | بزووتین | بزووتن |
| خەفتن | خەفت | خەفتم | خەفتی | خەفت | خەفتین | خەفتن |
| کەفتن | کەفت | کەفتم | کەفتی | کەفت | کەفتین | کەفتن |
| نیشتن | نیشت | نیشتم | نیشتی | نیشت | نیشتین | نیشتن |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| گەیشتن | گەیشت | گەیشتم | گەیشتی | گەیشت | گەیشتین | گەیشتن |
| نووستن | نووست | نووستم | نووستی | نووست | نووستین | نووستن |
| ڕۆیشتن | ڕۆیشت | ڕۆیشتم | ڕۆیشتی | ڕۆیشت | ڕۆیشتین | ڕۆیشتن |
| هاتن | هات | هاتم | هاتی | هات | هاتین | هاتن |

رابردووی بەردەوام: دە+ قەدا چاوگ+ جێناڤا لکاو

| چاوگ | قەدا چاوگ | جێناڤا لکاو بۆ کەسا | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | تاک | | | کۆ | |
| | | ١ | ٢ | ٣ | ١ | ٢ ، ٣ |
| | | دە +قەد +م | دە +قەد +ی | دە + قەد | دە +قەد +ین | دە +قەد +ن |
| ئاخافتن | ئاخافت | دەئاخافتم | دەئاخافتی | دەئاخافت | دەئاخافتین | دەئاخافتن |
| بزووتن | بزووت | دەبزووتم | دەبزووتی | دەبزووت | دەبزووتین | دەبزووتن |
| خەفتن | خەفت | دەخەفتم | دەخەفتی | دەخەفت | دەخەفتین | دەخەفتن |
| کەفتن | کەفت | دەکەفتم | دەکەفتی | دەکەفت | دەکەفتین | دەکەفتن |
| نیشتن | نیشت | دەنیشتم | دەنیشتی | دەنیشت | دەنیشتین | دەنیشتن |
| گەیشتن | گەیشت | دەگەیشتم | دەگەیشتی | دەگەیشت | دەگەیشتین | دەگەیشتن |
| نووستن | نووست | دەنووستم | دەنووستی | دەنووست | دەنووستین | دەنووستن |
| ڕۆیشتن | ڕۆیشت | دەڕۆیشتم | دەڕۆیشتی | دەڕۆیشت | دەڕۆیشتین | دەڕۆیشتن |
| هاتن | هات | دەهاتم | دەهاتی | دەهات | دەهاتین | دەهاتن |

رابردووی دوور: قەدا چاوگ+ بوو+ جێناڤا لکاو

| چاوگ | قەدا چاوگ | جێناڤا لکاو بۆ کەسا | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | تاک | | | کۆ | |
| | | ١<br>قەد+ بوو<br>+م | ٢<br>قەد+بوو<br>+ی | ٣<br>قەد+بوو | ١<br>قەد+بوو<br>+ین | ٢ ، ٣<br>قەد+بوو<br>+ن |
| ئاخافتن | ئاخافت | ئاخافت بووم | ئاخافت بووی | ئاخافت بوو | ئاخافت بووین | ئاخافت بوون |
| بزووتن | بزووت | بزووت بووم | بزووت بووی | بزووت بوو | بزووت بووین | بزووت بوون |
| خەفتن | خەفت | خەفت بووم | خەفت بووی | خەفت بوو | خەفت بووین | خەفت بوون |
| کەفتن | کەفت | کەفت بووم | کەفت بووی | کەفت بوو | کەفت بووین | کەفت بوون |
| نیشتن | نیشت | نیشت بووم | نیشت بووی | نیشت بوو | نیشت بووین | نیشت بوون |
| گەیشتن | گەیشت | گەیشت بووم | گەیشت بووی | گەیشت بوو | گەیشت بووین | گەیشت بوون |
| نووستن | نووست | نووست بوم | نووست بووی | نووست بوو | نووست بووین | نووست بوون |
| ڕۆیشتن | ڕۆیشت | ڕۆیشت بووم | ڕۆیشت بووی | ڕۆیشت بوو | ڕۆیشت بووین | ڕۆیشت بوون |
| هاتن | هات | هات بووم | هات بووی | هات بوو | هات بووین | هات بوون |

**ڕابردووی تەواو: قەدا چاوگ + جێناڤا لکاو+ ە**

| چاوگ | قەدا چاوگ | جێناڤا لکاو بۆ کەسا | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | تاک | | | کۆ | |
| | | ١<br>قەد+م<br>+ە | ٢<br>قەد+ی<br>+تە | ٣<br>قەد+یە | ١<br>قەد+ین+ە | ٢، ٣<br>قەد+ن+ە |
| ئاخافتن | ئاخافت | ئاخافتمە | ئاخافتیتە | ئاخافتیە | ئاخافتینە | ئاخافتنە |
| بزووتن | بزووت | بزووتمە | بزووتیتە | بزووتیە | بزووتینە | بزووتنە |
| خەفتن | خەفت | خەفتمە | خەفتیتە | خەفتیە | خەفتینە | خەفتنە |
| کەفتن | کەفت | کەفتمە | کەفتیتە | کەفتیە | کەفتینە | کەفتنە |
| نیشتن | نیشت | نیشتمە | نیشتیتە | نیشتیە | نیشتینە | نیشتنە |
| گەیشتن | گەیشت | گەیشتمە | گەیشتیتە | گەیشتیە | گەیشتینە | گەیشتنە |
| ڕۆیشتن | ڕۆیشت | ڕۆیشتمە | ڕۆیشتیتە | ڕۆیشتیە | ڕۆیشتینە | ڕۆیشتنە |
| هاتن | هات | هاتمە | هاتیتە | هاتیە | هاتینە | هاتنە |

## ٢.٥.٣.٢.١.١.٥ کۆمەلا /دن/

**ڕابردووی نزیک: قەدا چاوگ+ جێناڤا لکاو**

| چاوگ | قەدا چاوگ | ڕەگا کردار | جێناڤا لکاو بۆ کەسا | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | تاک | | | کۆ | |
| | | | ١<br>قەد+ م | ٢<br>قەد+ ی | ٣<br>قەد | ١<br>قەد+ین | ٢، ٣<br>قەد+ ن |
| مردن | مرد | مر | مردم | مردی | مرد | مردین | مردن |

**ڕابردووی بەردەوام: دە+قەدا چاوگ+ جێناڤا لکاو**

| چاوگ | قەدا چاوگ | ڕەگا کردار | جێنافا لکاو بۆ کەسا | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | تاک | | | کۆ | |
| | | | ١ | ٢ | ٣ | ١ | ٢ ، ٣ |
| | | | دە +قەد +م | دە +قەد +ی | دە + قەد | دە +قەد +ین | دە +قەد +ن |
| مردن | مرد | مر | دەمردم | دەمردی | دەمرد | دەمردین | دەمردن |

## ڕابردووی دوور: قەدا چاوگ+ بوو+ جێنافا لکاو

| چاوگ | قەدا چاوگ | ڕەگا کردار | جێنافا لکاو بۆ کەسا | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | تاک | | | کۆ | |
| | | | ١ | ٢ | ٣ | ١ | ٢ ، ٣ |
| | | | قەد+ بوو+م | قەد+بوو +ی | قەد+بوو | قەد+بوو +ین | قەد+ بوو+ن |
| مردن | مرد | مر | مردبووم | مرد بووی | مرد بوو | مردبووین | مردبوون |

## ڕابردووی تەواو: قەدا چاوگ+ جێنافا لکاو+ ە

| چاوگ | قەدا چاوگ | جێنافا لکاو بۆ کەسا | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | تاک | | | کۆ | |
| | | ١ | ٢ | ٣ | ١ | ٢ ، ٣ |
| | | قەد+م+ە | قەد+ی+تە | قەد+یە | قەد+ین+ە | قەد+ن+ە |
| مردن | مرد | مردمە | مردیتە | مردیە | مردینە | مردنە |

## ٢.٥.٣.٢.١.٢ چاوگێن تێپەڕ

لەگەل چاوگێن تێپەڕ بکەر و بەرکار هەیە. چاوگێن تێپەڕ بۆ دەما بوری هەرگیز/تووجار نایەنە گەردان کردن. واتە جێناڤا لکاو لەگەل چاوگێن تێپەڕ نییە. هەلبەت بەرکار دەکرێ ناڤ یان جێناڤ بێ.

### ٢.٥.٣.٢.١.٢.١ کۆمەلا /ان/

لە ئەڤ کۆمەلە قەدا چاوگ بە لابرنا دەنگا/تیپا /ن/ دروست دەبێ.

| چاوگ | قەدا چاوگ | ڕابردووی نزیک = قەد | ڕابردووی بەردەوام دە + قەد | ڕابردووی دوور قەد + بوو | ڕابردووی تەواو قەد+ یە |
|---|---|---|---|---|---|
| بێژان | بێژا | بێژا | دەبێژا | بێژا بوو | بێژایە |
| پێچان | پێچا | پێچا | دەپێچا | پێچا بوو | پێچایە |
| پیڤان | پیڤا | پیڤا | دەپیڤا | پیڤا بوو | پیڤایە |
| دان | دا | دا | دەدا | دابوو | دایە |
| هێنان[٢٦] | هێنا | هێنا | دەهێنا | هێنا بوو | هێنایە |
| کێلان | کێلا | کێلا | دەکێلا | کێلا بوو | کێلایە |
| شێلان | شێلا | شێلا | دەشێلا | شێلا بوو | شێلایە |
| کێشان | کێشا | کێشا | دەکێشا | کێشا بوو | کێشایە |

[26] بنەڕە کردارا "ئانین" لە کۆمەلا /ین/ ٢.٥.٣.٢.١.٢.٢ کو لەگەل "هێنان" هەڤواتایە.

نموونە:

| ژمارە | کەس | ڕستەی سادە | ڕستەی لێکدراو |
|---|---|---|---|
| تاک | ١ | من ساڤەرکە بێژا. | دەما تو هاتی من ساڤەر دەبێژا. |
| | ٢ | تۆ قەپانەکە کێشا. | پێش هاتنا ئەوی، من قەپان کێشابوو. |
| | ٣ | ئەوی پەتووەکە پێچایە. | دەما ئازاد هات ئەوێ پەتووەکە دەپێچا. |
| کۆ | ١ | ئێمە زەوییەکە کێلا. | ئێمە زەوییەکە دەکێلا کاتێ ئەوی هات. |
| | ٢ | هوون/ئێوە ئازاد هێنا. | کو ئەوی هات ئێوە زەوی دەکێلا. |
| | ٣ | ئەوان پارە دایە. | پێش چوونا من ئەوان پارە دابوو. |

## ٢.٥.٣.٢.١.٢.٢ کۆمەلا /ین/

لە ئەڤ کۆمەلە قەدا چاوگ بە لابردنا دەنگا/تیپا /ن/ دێتە دروست کردن.

| چاوگ | قەدا چاوگ | ڕابردووی نزیک = قەدا چاوگ | ڕابردووی بەردەوام دە +قەدا چاوگ | ڕابردووی دوور قەدا چاوگ + بوو | ڕابردووی تەواو قەدا چاوگ + یە |
|---|---|---|---|---|---|
| ئاژنین | ئاژنی | ئاژنی | دەئاژنی | ئاژنی بوو | ئاژنییە |
| ئانین | ئانی | ئانی | دەئانی | ئانی بوو | ئانییە |
| بڕین | بڕی | بڕی | دەبڕی | بڕی بوو | بڕییە |
| بەخشین | بەخشی | بەخشی | دەبەخشی | بەخشی بوو | بەخشییە |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| بوورین | بووری | بووری | دەبووری | بووری بوو | بوورییە |
| بینین | بینی | بینی | دەبینی | بینی بوو | بینییە |
| پۆشین | پۆشی | پۆشی | دەپۆشی | پۆشی بوو | پۆشییە |
| پشکنین | پشکنی | پشکنی | دەپشکنی | پشکنی بوو | پشکنییە |
| پرسین | پرسی | پرسی | دەپرسی | پرسی بوو | پرسییە |
| تاشین | تاشی | تاشی | دەتاشی | تاشی بوو | تاشییە |
| چنین | چنی | چنی | دەچنی | چنی بوو | چنییە |
| دڕین | دڕی | دڕی | دەدڕی | دڕی بوو | دڕییە |
| دزین | دزی | دزی | دەدزی | دزی بوو | دزییە |
| دۆزین | دۆزی | دۆزی | دەدۆزی | دۆزی بوو | دۆزییە |
| دۆشین | دۆشی | دۆشی | دەدۆشی | دۆشی بوو | دۆشییە |
| زانین | زانی | زانی | دەزانی | زانی بوو | زانییە |
| ژەنین | ژەنی | ژەنی | دەژەنی | ژەنی بوو | ژەنییە |
| سڕین | سڕی | سڕی | دەسڕی | سڕی بوو | سڕییە |
| سمین | سمی | سمی | دەسمی | سمی بوو | سمییە |
| کڕین | کڕی | کڕی | دەکڕی | کڕی بوو | کڕییە |
| مالین | مالی | مالی | دەمالی | مالی بوو | مالییە |
| مژین | مژی | مژی | دەمژی | مژی بوو | مژییە |
| نووسین | نووسی | نووسی | دەنووسی | نووسی بوو | نووسییە |
| هاڕین | هاڕی | هاڕی | دەهاڕی | هاڕی بوو | هاڕییە |

نموونە:

| ڕستەی لێکدراو | ڕستەی سادە | ژمارە | کەس |
|---|---|---|---|
| دەما تو هاتی من ئەوی دەبووری. | من ئەوی بووری. | ١ | تاک |
| پێش هاتنا من، ئەوی دیارییکە بەخشی بوو. | تو دیارییەکە بەخشی. | ٢ | |
| ئەوێ پێشتر گوندەکە نەدی بوو. | ئەوی/ئەوێ گوندەکە بینی. | ٣ | |
| کو هوون هاتن ئێمە کراسەکان پۆشیبوو. | ئێمە کراسەکە پۆشی. | ١ | کۆ |
| بەر لە چوونا من هوون پارەکە دزی بوو. | هوون/ئێوە پارەکە دزی. | ٢ | |
| پێش ئێمە، ئەوان نهێنییەکە زانی بوو. | ئەوان نهێنییەکە زانییە. | ٣ | |

## ٢.٥.٣.٢.١.٢.٣ کۆمەلا /وون/

لە ئەڤ کۆمەلە قەد و ڕەگا چاوگ بە لابردنا دەنگا/تیپا /ن/ دێتە دروستکردن.

| چاوگ | قەدا چاوگ | ڕابردووی نزیک = قەدا چاوگ | ڕابردووی بەردەوام دە +قەدا چاوگ | ڕابردووی دوور قەدا+ بوو | ڕابردووی تەواو قەدا چاوگ +یە |
|---|---|---|---|---|---|
| دروون | دروو | دروو | دەدروو | دروو بوو | درووبە |
| گروون | گروو | گروو | دەگروو | گروو بوو | گرووبە |
| جوون | جوو | جوو | دەجوو | جوو بوو | جووبە |
| سوون | سوو | سوو | دەسوو | سوو بوو | سووبە |

نموونە:

| ژمارە | کەس | ڕستە |
|---|---|---|
| تاک | ١ | پێش هاتنا من تو کراسەکە درووبوو. |
| | ٢ | تو بنێشتەکە جوو؟ |
| | ٣ | ئەوێ کراسەکە درووبە. |
| کۆ | ١ | ئێمە کراسەکە دروو. |
| | ٢ | هوون/ئێوە بنێشت جوو. |
| | ٣ | ئەوان کراسەکە دروو. |

### ٢.٥.٣.٢.١.٢.٤ کۆمەلا /تن/

لە ئەڤ کۆمەلە قەدا چاوگ بە لابردنا دەنگا/تیپا /ن/ دێتە دروست کردن.

| چاوگ | قەدا چاوگ | ڕابردووی نزیک = قەدا چاوگ | ڕابردووی بەردەوام دە+قەد | ڕابردووی دوور قەد+ بوو | ڕابردووی تەواو قەد+ یە |
|---|---|---|---|---|---|
| ئاژوتن | ئاژوت | ئاژوت | دەئاژوت | ئاژوت بوو | ئاژوتیە |
| ئاڤێژتن | ئاڤێژت | ئاڤێژت | دەئاڤێژت | ئاڤێژت بوو | ئاڤێژتیە |
| بیستن | بیست | بیست | دەبیست | بیست بوو | بیستیە |
| بەستن | بەست | بەست | دەبەست | بەست بوو | بەستیە |
| پالافتن | پالافت | پالافت | دەپالافت | پالافت بوو | پالافتیە |
| پاراستن | پاراست | پاراست | دەپاراست | پاراست بوو | پاراستیە |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| پەرستن | پەرست | پەرست | دەپەرست | پەرست بوو | پەرستیە |
| چێژتن | چێژت | چێژت | دەچێژت | چێژت بوو | چێژتیە |
| خستن | خست | خست | دەخست | خست بوو | خستیە |
| دیتن | دیت | دیت | دەدیت | دیت بوو | دیتیە |
| ڕشتن | ڕشت | ڕشت | دەڕشت | ڕشت بوو | ڕشتیە |
| کرۆشتن | کرۆشت | کرۆشت | دەکرۆشت | کرۆشت بوو | کرۆشتیە |
| کوشتن | کوشت | کوشت | دەکوشت | کوشت بوو | کوشتیە |
| گرتن | گرت | گرت | دەگرت | گرت بوو | گرتیە |
| گۆتن | گۆت | گۆت | دەگۆت | گۆت بوو | گۆتیە |
| گەستن | گەست | گەست | دەگەست | گەست بوو | گەستیە |
| هاڤیشتن | هاڤیشت | هاڤیشت | دەهاڤیشت | هاڤیشتبوو | هاڤیشتیە |
| هێشتن | هێشت | هێشت | دەهێشت | هێشت بوو | هێشتیە |
| ویستن | ویست | ویست | دەویست | ویست بوو | ویستیە |

نموونە:

| ژمارە | کەس | ڕستە |
|---|---|---|
| تاک | ١ | من ئۆتۆمبیلەکە ئاژوتیە. |
| | ٢ | تو قسەکە بیست. |
| | ٣ | ئەوی بەردەک هاڤێژت. |
| کۆ | ١ | پێش هاتنا ئێوە، ئێمە نەفتەکە پالافت بوو. |
| | ٢ | هوون/ئێوە خواردنەکە چێژت. |
| | ٣ | دەما ئێمە چووین ئەوان پەیکەرەکە دەخست. |

### ٢.٥.٣.٢.١.٢.٥ کۆمەلا /دن/

لە ئەڤ کۆمەلە قەدا چاوگ بە لابردنا دەنگا/تیپا /ن/ دێتە دروست کردن.

| چاوگ | قەدا چاوگ | رابردووی نزیک = قەدا چاوگ | رابردووی بەردەوام دە + قەد | رابردووی دوور قەد+ بوو | رابردووی تەواو قەد+ یە |
|---|---|---|---|---|---|
| بردن | برد | برد | دەبرد | برد بوو | بردیە |
| بژاردن | بژارد | بژارد | دەبژارد | بژارد بوو | بژاردیە |
| بواردن | بوارد | بوارد | دەبوارد | بوارد بوو | بواردیە |
| خاردن | خارد | خارد | دەخارد | خارد بوو | خاردیە |
| خاندن | خاند | خاند | دەخاند | خاند بوو | خاندیە |
| چاندن | چاند | چاند | دەچاند | چاند بوو | چاندیە |
| ژماردن | ژمارد | ژمارد | دەژمارد | ژمارد بوو | ژماردیە |
| ژەندن | ژەند | ژەند | دەژەند | ژەند بوو | ژەندیە |
| سپاردن | سپارد | سپارد | دەسپارد | سپارد بوو | سپاردیە |
| سەندن/ | سەند/ | سەند/ | دەسەند/ | سەند بوو/ | سەندیە/ |
| ستاندن | ستاند | ستاند | دەستاند | ستاند بوو | ستاندیە |
| کردن | کرد | کرد | دەکرد | کرد بوو | کردیە |

نموونە:

| ڕسته | کەس | ژمارە |
|---|---|---|
| من پارەکە دەبرد کو تو هاتی. | ١ | تاک |
| تو چیرۆکەکە خوێند بوو، پێش هاتنا ئێمە. | ٢ | |
| ئەوێ شمشالەکە ژەندیە. | ٣ | |
| پێش سالەک ئێمە دارەکە چاندیە. | ١ | کۆ |
| هوون/ئێوە نامەکە بە ئێمە سپارد. | ٢ | |
| کو ئێمە چووین ئەوان کارەکە کرد بوو. | ٣ | |

## ٢.٥.٣.٢.٢ دەما نها

لە زمانا کوردی دەما نها بۆ دەما نها و دەما ئایندە دێتە دابەشکردن.

**١. کردارێن دەما نها** باس لە کەسەک دەکا کو هەنووکە کردارەک دەکا، یان کەسەک باس لە تشتەک وەک (چالاکی، گۆڕانکاری یان ڕەوش)ەکی هەنووکەیی دەکا. هەنووکە دەکرێ ئێستا، ئەمڕۆ، ئەڤ هەفتە، ئەڤ سال یان ئەڤ سەدە بێ. واتە دەما/کاتا کردەوەی کردار بەردەوامە و دوماهی نەهاتییە.

**چالاکی مینا:** ئازاد وەرزش دەکا. نەسرین بۆ قوتابخانە دەڕوا. ئێمە نان دەخۆین. ئەوان خەما ئێمە دەخۆن.

**گۆڕانکاری مینا:** شیلان جلک دەشۆرێ. ئازاد تەندروستی باش دەبێ. ڕەوشەکە باشتر دەبێ. ئێوە زیرەک تر دەبن.

**ڕەوش مینا:** باران دەبارێ. لە پایزان گەلای داران دەوەرێ.

**٢. کردارێن دەما ئایندە** باس لە کردەوەی کردارەک بۆ پاش نها دەکا. کردارێن دەما ئایندە بە یارمەتی هەڤالکردار و کردارێن هاریکار دێنە چێکردن[٢٧].

---

[27] بنەڕە کردارێن هاریکار ٢.٥.٦.

ئازاد سبەی وەرزش دەکا. ئازاد دەبێ وەرزش بکا. هوون دەبێ بچن بۆ قوتابخانە. ئەوان هەیڤەکا دی دەچن بۆ باژێرا مەندەلی.

پرانی کردارێن نها لە رەگا چاوگ، تێپەر یان تێنەپەر، دێنە وەرگرتن. هەرچۆنەک بێ هەندەک چاوگ رێسای ناوێز بە خۆ هەنە. ئاساییانە رەگا چاوگ بە لابردنا نیشانەی /ان/، /ین/، /وون/، /تن/ و /دن/ بۆ هەردوو چاوگێن تێپەر و تێنەپەر چێ دەبێ. ئێمە یەکەم جار باس لە وان چاوگان دەکەین کو بەر رێسای ئاسایی دەکەفن و پاشتر باس لە وان چاوگان دەکەین کو بەر رێسای ناوێز دەکەفن. من هەنووکە هێدی هێدی بەپێی وان پێنج کۆمەلە ئاماژە بە چاوگ و فۆرما کردارا نها دەکەم.

### ٢.٥.٣.٢.٢.١ کۆمەلا /ان/

| چاوگ | رەگا چاوگ | جێناڤا لکاو | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | تاک | | | کۆ | |
| | | ١<br>دە +رەگ<br>+م | ٢<br>دە +رەگ<br>+ی | ٣<br>دە + رەگ<br>+ ێ | ١<br>دە + رەگ+<br>ین | ٢، ٣<br>دە + رەگ<br>+ ن |
| تۆران | تۆر | دەتۆرم | دەتۆری | دەتۆرێ | دەتورین | دەتۆرن |
| خنکان | خنک | دەخنکم | دەخنکی | دەخنکێ | دەخنکین | دەخنکن |
| رازان | راز | دەرازم | دەرازی | دەرازێ | دەرازین | دەرازن |
| رووخان | رووخ | دەرووخم | دەرووخی | دەرووخێ | دەرووخین | دەرووخن |
| شێوان | شێو | دەشێوم | دەشێوی | دەشێوێ | دەشێوین | دەشێون |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| گەڕان | گەڕ | دەگەڕم | دەگەڕی | دەگەڕێ | دەگەڕین | دەگەڕن |
| گلان | گل | دەگلم | دەگلی | دەگلێ | دەگلین | دەگلن |
| شکان | شک | دەشکم | دەشکی | دەشکێ | دەشکین | دەشکن |
| دڕان | دڕ | دەدڕم | دەدڕی | دەدڕێ | دەدڕین | دەدڕن |
| ترسان | ترس | دەترسم | دەترسی | دەترسێ | دەترسین | دەترسن |
| وەستان | وەست | دەوەستم | دەوەستی | دەوەستێ | دەوەستین | دەوەستن |
| سووتان | سووت | دەسووتم | دەسووتی | دەسووتی | دەسووتین | دەسووتن |
| گریان | گری | دەگریم | دەگری | دەگریێ | دەگرین | دەگرین |
| بێژان | بێژ | دەبێژم | دەبێژی | دەبێژێ | دەبێژین | دەبێژن |
| پێچان | پێچ | دەپێچم | دەپێچی | دەپێچێ | دەپێچین | دەپێچن |
| پیڤان | پیڤ | دەپیڤم | دەپیڤی | دەپیڤێ | دەپیڤین | دەپیڤن |
| هێنان | هێن | دەهێنم | دەهێنی | دەهێنی | دەهێنین | دەهێنن |
| کێلان | کێل | دەکێلم | دەکێلی | دەکێلێ | دەکێلین | دەکێلن |
| شێلان | شێل | دەشێلم | دەشێلی | دەشێلێ | دەشێلین | دەشێلن |
| کێشان | کێش | دەکێشم | دەکێشی | دەکێشێ | دەکێشین | دەکێشن |

## ٢.٥.٣.٢.٢.٢ کۆمەلا /ین/

| چاوگ | ڕەگا چاوگ | جێناڤا لکاو | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | تاک | | | کۆ | |
| | | ١<br>دە +ڕەگ<br>+م | ٢<br>دە +ڕەگ<br>+ی | ٣<br>دە + ڕەگ<br>+ ێ | ١<br>دە + ڕەگ<br>+ ین | ٢، ٣<br>دە + ڕەگ<br>+ ن |
| بەزین | بەز | دەبەزم | دەبەزی | دەبەزێ | دەبەزین | دەبەزن |
| پەیڤین | پەیڤ | دەپەیڤم | دەپەیڤی | دەپەیڤێ | دەپەیڤین | دەپەیڤن |
| پەڕین | پەڕ | دەپەڕم | دەپەڕی | دەپەڕێ | دەپەڕین | دەپەڕن |
| تەزین | تەز | دەتەزم | دەتەزی | دەتەزێ | دەتەزین | دەتەزن |
| تەقین/ | تەق/ | دەتەقم | دەتەقی | دەتەقێ/ | دەتقین/ | دەتەقن/ |
| پەقین | پەق | دەپەقم | دەپەقی | دەپەقێ | دەپەقین | دەپەقن |
| تۆقین | تۆق | دەتۆقم | دەتۆقی | دەتۆقێ | دەتۆقین | دەتۆقن |
| خزین | خز | دەخزم | دەخزی | دەخزێ | دەخزین | دەخزین |
| خەنین/ | خەن/ | دەخەنم/ | دەخەنی/ | دەخەنێ/ | دەخەنین/ | دەخەنن/ |
| کەنین | کەن | دەکەنم | دەکەنی | دەکەنێ | دەکەنین | دەکەنن |
| چەقین | چەق | دەچەقم | دەچەقی | دەچەقێ | دەچەقین | دەچەقن |
| نەڕین | نەڕ | دەنەڕم | دەنەڕی | دەنەڕێ | دەنەڕین | دەنەڕن |
| لەقین | لەق | دەلەقم | دەلەقی | دەلەقێ | دەەلقین | دەلەقن |
| کۆکین | کۆک | دەکۆکم | دەکۆکی | دەکۆکێ | دەکۆکین | دەکۆکن |
| گەنین | گەن | دەگەنم | دەگەنی | دەگەنێ | دەگەنین | دەگەنن |
| نالین | نال | دەنالم | دەنالی | دەنالێ | دەنالین | دەنالن |
| فڕین | فڕ | دەفڕم | دەفڕی | دەفڕێ | دەفڕین | دەفڕن |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| زڤڕین | زڤڕ | دەزڤڕم | دەزڤڕی | دەزڤڕێ | دەزڤڕین | دەزڤڕن |
| ڕەڤین | ڕەڤ | دەڕەڤم | دەڕەڤی | دەڕەڤێ | دەڕەڤین | دەڕەڤن |
| ئاژنین | ئاژن | دەئاژنم | دەئاژنی | دەئاژنێ | دەئاژنین | دەئاژنن |
| بڕین | بڕ | دەبڕم | دەبڕی | دەبڕێ | دەبڕین | دەبڕن |
| بەخشین | بەخش | دەبەخشم | دەبەخشی | دەبەخشێ | دەبەخشین | دەبەخشن |
| بوورین | بوور | دەبوورم | دەبووری | دەبوورێ | دەبوورین | دەبوورن |
| بینین | بین | دەبینم | دەبینی | دەبینێ | دەبینین | دەبینن |
| پۆشین | پۆش | دەپۆشم | دەپۆشی | دەپۆشێ | دەپۆشین | دەپۆشن |
| پشکنین | پشکن | دەپشکنم | دەپشکنی | دەپشکنێ | دەپشکنین | دەپشکنن |
| پرسین | پرس | دەپرسم | دەپرسی | دەپرسێ | دەپرسین | دەپرسن |
| تاشین | تاش | دەتاشم | دەتاشی | دەتاشێ | دەتاشین | دەتاشن |
| چنین | چن | دەچنم | دەچنی | دەچنێ | دەچنین | دەچنن |
| دڕین | دڕ | دەدڕم | دەدڕی | دەدڕێ | دەدڕین | دەدڕن |
| دزین | دز | دەدزم | دەدزی | دەدزێ | دەدزین | دەدزن |
| دۆزین | دۆز | دەدۆزم | دەدۆزی | دەدۆزێ | دەدۆزین | دەدۆزن |
| دۆشین | دۆش | دەدۆشم | دەدۆشی | دەدۆشێ | دەدۆشین | دەدۆشن |
| زانین | زان | دەزانم | دەزانی | دەزانێ | دەزانین | دەزانن |
| ژەنین | ژەن | دەژەنم | دەژەنی | دەژەنێ | دەژەنین | دەژەنن |
| سڕین | سڕ | دەسڕم | دەسڕی | دەسڕێ | دەسڕین | دەسڕن |
| سمین | سم | دەسمم | دەسمی | دەسمێ | دەسمین | دەسمن |
| کڕین | کڕ | دەکڕم | دەکڕی | دەکڕێ | دەکڕین | دەکڕن |
| مالین | مال | دەمالم | دەمالی | دەمالێ | دەمالین | دەمالن |
| مژین | مژ | دەمژم | دەمژی | دەمژێ | دەمژین | دەمژن |
| نووسین | نووس | دەنووسم | دەنووسی | دەنووسێ | دەنووسین | دەنووسن |
| هاڕین | هاڕ | دەهاڕم | دەهاڕی | دەهاڕێ | دەهاڕین | دەهاڕن |

### ٢.٥.٣.٢.٢.٣ کۆمەلا /وون/

| چاوگ | ڕەگا چاوگ | جێناڤا لکاو | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | تاک | | | کۆ | |
| | | ١<br>دە +ڕەگ<br>+م | ٢<br>دە +ڕەگ<br>+ی | ٣<br>دە + ڕەگ<br>+ ێ | ١<br>دە + ڕەگ<br>+ ین | ٢، ٣<br>دە + ڕەگ<br>+ ن |
| بوون | ب | دەبم | دەبی | دەبێ | دەبین | دەبن |
| چوون | چ | دەچم | دەچی | دەچێ | دەچین | دەچن |
| دروون | درو و | دەدرووم | دەدرووی | دەدرووێ | دەدرووین | دەدروون |
| گروون | گروو | دەگرووم | دەگرووی | دەگرووێ | دەگرووین | دەگروون |
| جوون | جوو | دەجووم | دەجووی | دەجووێ | دەجووین | دەجوون |
| سوون | سوو | دەسووم | دەسووی | دەسووێ | دەسووین | دەسوون |

### ٢.٥.٣.٢.٢.٤ کۆمەلا /تن/

| چاوگ | ڕەگا چاوگ | جێناڤا لکاو | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | تاک | | | کۆ | |
| | | ١<br>دە +ڕەگ<br>+م | ٢<br>دە +ڕەگ<br>+ی | ٣<br>دە + ڕەگ<br>+ ێ | ١<br>دە + ڕەگ<br>+ ین | ٢، ٣<br>دە + ڕەگ<br>+ ن |
| ئاخافتن | ئاخاف | دەئاخفم | دەئاخفی | دەئاخفێ | دەئاخفین | دەئاخفن |
| بزووتن | بزوو | دەبزووم | دەبزووی | دەبزووێ | دەبزووین | دەبزوون |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| نیشتن | نیش | دەنیشم | دەنیشی | دەنیشێ | دەنیشین | دەنیشن |
| خەفتن | خەف | دەخەفم | دەخەفی | دەخەفێ | دەخەفین | دەخەفن |
| کەفتن | کەف | دەکەفم | دەکەفی | دەکەفێ | دەکەفین | دەکەفن |
| ئاژوتن | ئاژو | دەئاژوم | دەئاژوی | دەئاژوێ | دەئاژووین | دەئاژوون |
| ئاڤێژتن | ئاڤێژ | دەئاڤێژم | دەئاڤێژی | دەئاڤێژێ | دەئاڤێژین | دەئاڤێژن |
| بیستن | بیس | دەبیسم | دەبیسی | دەبیسێ | دەبیسین | دەبیسن |
| بەستن | بەس | دەبەسم | دەبەسی | دەبەسێ | دەبەسین | دەبەسن |
| پەرستن | پەرس | دەپەرسم | دەپەرسی | دەپەرسێ | دەپەرسین | دەپەرسن |
| چێژتن | چێژ | دەچێژم | دەچێژی | دەچێژێ | دەچێژین | دەچێژن |

## ٢.٥.٣.٢.٢.٥ کۆمەلا /دن/

| چاوگ | ڕەگا چاوگ | جێناڤا لکاو | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | تاک | | | کۆ | |
| | | ١<br>دە +<br>ڕەگ+م | ٢<br>دە +<br>ڕەگ+ی | ٣<br>دە +<br>ڕەگ+ ێ | ١<br>دە +<br>ڕەگ+ین | ٢، ٣<br>دە +<br>ڕەگ+ن |
| مردن | مر | دەمرم | دەمری | دەمرێ | دەمرین | دەمرن |
| ژەندەن | ژەن | دەژەنم | دەژەنی | دەژەنێ | دەژەنین | دەژەنن |
| سەندن | سەن | دەسەنم | دەسەنی | دەسەنێ | دەسەنین | دەسەنن |
| شۆردن | شۆر | دەشۆرم | دەشۆری | دەشۆرێ | دەشۆرین | دەشۆرن |

## ٢.٥.٣.٢.٢.٦ کۆمەلا ناوێز

ڕێگەی بنەڕەتی بۆ دەرهێنانا ڕەگا کردار لە چاوگ لابردنا نیشانەی چاوگە؛ واتە لابردنا دەنگێن /ان/، /ین/، /وون/، /دن/ و /تن/ ە. پرانی چاوگێن خشتەێن ژوورو بەپێی ڕێسای بنەڕەتی بۆ ڕەگا کردار دێتە گۆڕین. هەرچۆنەک بێ هەندەک چاوگ لەگۆڕ ئەڤ ڕێسایە نایەتە گۆڕین. ئێمە بە ڤان چاوگان دەبێژین ناوێز. ئێمە چاوگێن ناوێز بەپێی ئەڤ پێنج کۆمەلە دەستنیشان دەکەین:

| چاوگ | ڕەگا چاوگ | جێناڤا لکاو | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | تاک | | | کۆ | |
| | | ١<br>دە+ڕەگ+م | ٢<br>دە+ڕەگ+ی | ٣<br>دە+ ڕەگ+ ێ، ا، - | ١<br>دە+ ڕەگ+ ین | ٢، ٣<br>دە+ ڕەگ+ ن |
| نان | نێ | دەنێم | دەنێی | دەنێ | دەنێین | دەنێن |
| دان | د | دەدەم | دەدەی | دەدا | دەدەین | دەدەن |
| مان | م | دەمێنم | دەمێنی | دەما | دەمێنین | دەمێنن |
| هاتن | – | دێم | دێی | دێ | دێن | دێن |
| ڕۆیین | ڕۆ | دەڕۆم | دەڕۆی | دەڕوا | دەڕۆین | دەڕۆن |
| ژین | ژ | دەژیم | دەژی | دەژێ | دەژین | دەژین |
| زاین | زێ | دەزێم | دەزێی | دەزێ | دەزێین | دەزێن |
| خستن | خ | دەخەم | دەخەی | دەخا | دەخەین | دەخەن |
| دیتن | بین | دەبینم | دەبینی | دەبینێ | دەبینین | دەبینن |
| گرتن | گر | دەگرم | دەگری | دەگری | دەگرین | دەگرن |

| | |
|---|---|
| تێک | تێکدان، تێکچوون |
| لێک | لێکدان، لێکچوون |
| ڕێک | ڕێکخستن، ڕێکبوون |

دووەم بە هاریکاری پاشگر: لە زمانا کوردی یەک پاشگر هەیە: ندن.

| چاوگ | چاوگ+ ندن | چاوگ | چاوگ+ ندن |
|---|---|---|---|
| تۆران | تۆراندن | گەڕان | گەڕاندن |
| ڕووخان | ڕووخاندن | ڕژان | ڕژاندن |
| شکان | شکاندن | برژان | برژاندن |
| گریان | گریاندن | دڕان | دڕاندن |
| بەزین | بەزاندن | سووتان | سووتاندن |
| لەقین | لەقاندن | لەرزان | لەرزاندن |
| نالین | نالاندن | مردن | مراندن |
| کەفتن | کەفاندن | خەفتن | خەفاندن |

## ٢.٥.٨.٢.٢ کردارێن لێکدراو

کردارێن لێکدراو لە ڕێگەی ناڤ، هەڤالناڤ، هەڤالکردار، ئامراز، ژمارە دێتە دروست کردن:

| ناڤ+ کردار | | هەڤالناڤ+ کردار | | هەڤالکردار+کردار | | ژمارە+ کردار | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| مل | ملنان | لاواز | لاوازبوون | دەر | دەرکردن | هیچ | هیچکردن |
| شەڕ | شەڕکردن | سوور | سوورکردن | فرە | فرەبوون | | هیچبوون |
| جێگا | جێگاگرتن | ئازاد | ئازادکردن | کێم | کێمبوون | یەک | یەکگرتن |
| ڕێگا | ڕێگاگردن | بلند | بلندبوون | دوا/ | دواکەفتن | | یەکخستن |

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ئاڤا | ئاڤاکردن | شەرم | شەرمکردن | پاش | پاشخستن | | |
| پەروەدە | پەروەردە | زەفت | زەفتکردن | پێش | پێشخستن | | |
| | — کردن | دلخۆش | دلخۆشبوون | | پێشڤەچوون | | |
| نان | ناندان/ نانکرین | ڕەش | ڕەشبوون | پتر | پترکردن | | |

لەگەل ئامراز مینا: **ئاخ/داخ** هەلکێشان، **خۆزگە** خواستن/کردن.

هەروەها لەگەل هەندەک وشەی بێ واتای دی مینا: وازهێنان/وازئانین، تووش بوون، پەککەفتن، نقوومبوون، هاندان هتد.

## ٢.٥.٩ دەستەواژەی کرداری

بە ڤان کرداران کو لە سێ وشە یان پتر (پێشبەند، ناڤ، جێناڤ، هەڤالناڤ، کردار) پێک هاتبێ دەگوترێ دەستەواژەی کرداری. کردار، لە دەستەواژەی کرداری، بە کرۆکا واتا دێتە خەملاندن. نها لەگەل هەندەک دەستەواژەی کرداری:

| کرۆکا دەستەواژە | دەستەواژەی کرداری |
|---|---|
| بوون | بە تەنگەڤە بوون، بە دۆست بوون |
| چوون | لە هۆش خۆ چوون/ لە هۆشڤە چوون، بە هۆش خۆ هاتن |
| کردن | بە ڕێ کردن، بە هیچ کردن، بە ئەنقەست کردن، بە جینۆساید کردن، بە زۆر پێ کردن، بە دوژمن کردن. |

| | |
|---|---|
| | دەست پێ کردن، دەست لە ناڤ دەست کردن.<br>ناو بڕی کردن.<br>خۆ گێل کردن، خۆ بە هێز کردن، خۆ پڕ چەک کردن.<br>لە هەمبەر کردن، بەراورد کردن.<br>شەرمەزار کردن، پرۆتیستۆ کردن.<br>سەرخۆشی کردن.<br>دەست بە دەست کردن، تەم و مژاوی کردن، هەرزان فرۆش کردن، سووکایەتی پێ کردن، هات و چۆ کردن، گەلە کۆمە کردن، سەردانی کردن، بێ کەلک کردن، نەفرەت لێ کردن |
| دان | لە هەڤ دان، بەرێ خۆ دان، دەرزی لێ دان، پیا هەلدان |
| هێنان | دان پێ هێنان، باوەڕ پێ هێنان |
| کەفتن | بە ڕێ کەفتن، لە هەڤ کەفتن |
| گرتن | بە هەند وەرگرتن، کەلک وەرگرتن |
| هاتن | هاتنە سەر خۆ، هاتنە هۆش خۆ |
| خستن | خستنە ژێر پێ، خستنە ژێر/سەر ئاڤ، خستنە ناڤ هەڕی/قوڕ. |

## ٢.٥.١٠ له چاوگ بۆ ناڤێن نوێ

به پترکردنا پێشگر یان پاشگر بۆ ڕەگا چاوگ وشەی نوێ (ناڤا کارا) دێنه دروست کردن. ناڤا کارا وەک خەسلەت/پەسن بۆ بکەرا کردار دێتە ئەژماردن.

### ٢.٥.١٠.١ له ڕێگەی پێشگرێن /ب/ و /نه/ یان تەنها به لابردنا نیشانەی چاوگ.

| چاوگ | ڕەگا چاوگ | پێشگر | ناڤا نوێ |
|---|---|---|---|
| وێران | وێر | | بوێر |
| کوشتن | کوش | ب | بکوژ |
| نووسین | نووس | | بنووس |
| بڕین | بڕ | | ببڕ |
| مردن | مر | | نەمر |
| بەزین | بەز | | نەبەز |
| ترسان | ترس | نه | نەترس |
| بەردان | بەرد | | نەبەرد |
| دیتن | دی | | نەدی |
| زانین | زان | | نەزان |
| دەستبڕین | دەستبڕ | | دەستبڕ |
| خوێن مژین | خۆێنمژ | | خۆێنمژ |
| ڕەشپۆشین | ڕەشپۆش | ----- | ڕەشپۆش |
| دووربینین | دووربین | | دووربین |
| پێش گرتن | پێشگر | | پێشگر |
| پاشگرتن | پاشگر | | پاشگر |

### ٢.٥.١٠.٢ له ڕێگەی پاشگرێن /ەر/، /ا/، /یار/ /ۆک/، /ەوار/، /ەک/، /ندە/، دە/یدە/:

| چاوگ | ڕەگا چاوگ | پاشگر | ناڤێن نوێ |
| --- | --- | --- | --- |
| خوێندن | خوێن | | خوێنەر |
| نووسین | نووس | | نووسەر |
| تێکۆشان | تێکوش | | تێکۆشەر |
| داهێنان | داهێن | ەر | داهێنەر |
| دانان | دان | | دانەر |
| کردن | | | بکەر |
| بردن | | | ببەر |
| دان | | | بدەر |
| توانین | توا | | توانا |
| زانین | زان | ا | زانا |
| بینین | بین | | بینا |
| کڕین | کڕ | | کڕیار |
| فرۆشتن | فرۆش | یار | فرۆشیار |
| زانین | زان | | زانیار |
| گەڕان | گەڕ | | گەڕۆک |
| خشان | خش | ۆک | خشۆک |
| لەرزین | لەرز | | لەرزۆک |
| پسان | پس | | پسۆک |
| ترسان | ترس | | ترسنۆک |
| گریان | گر | نۆک | گرینۆک |

| | | | |
|---|---|---|---|
| خوێندن | خوێند | ەوار | خوێندەوار |
| ڕووان | ڕوو | ەک | ڕووەک |
| گەزین | گەز | | گەزندە |
| بەخشین | بەخش | ندە | بەخشندە |
| کوشتن | کوش | | کوشندە |
| دیتن | دی | دە/یدە | دیدە |
| گەڕان | گەڕ | | گەڕیدە |

## ٢.٥.١٠.٣ نافێن چاوگ

بێ هیچ گۆڕانکارییەک لە ڕەگا هەندەک چاوگ ناف دێتە دروست کردن. مینا:

| چاوگ | ڕەگا چاوگ | نافا چاوگ |
|---|---|---|
| لەرزان/لەرزین | لەرز | لەرز |
| ئێشان | ئێش | ئێش |
| لەوەڕان/لەوەڕین | لەوەڕ | لەوەڕ |
| ترسان | ترس | ترس |
| پێچان | پێچ | پێچ |
| پرسین | پرس | پرس |
| پاراستن | پارێز | پارێز |
| چێژتن | چێژ | چێژ |

لە ڕێگەی هەندەک پاشگر نافێن نوێ لە ڕەگا چاوگ دێنە دروست کردن مینا:

| چاوگ | ڕەگا چاوگ | پاشگر | ناڤا نوێ |
|---|---|---|---|
| لەرزان/لەرزین | لەرز | | لەرزە |
| کۆکین | کۆک | | کۆکە |
| نالین | نال | ە | نالە |
| لەقین | لەق | | لەقە |
| لەنگین | لەنگ | | لەنگە |
| کێشان | کێش | | کێشە |
| پرسین | پرس | | پرسە |
| هاڕین | هاڕ | | هاڕە |
| ڕەڤین | ڕەڤ | | ڕەڤە |
| پەککەفتن | پەککەفت | ە | پەککەفتە |
| کوشتن | کوشت | | کوشتە |
| ڕستن | ڕست | | ڕستە |
| توانین | توان | ست | توانست |
| زانین | زان | | زانست |
| پۆشین | پۆش | اک | پۆشاک |
| خواردن | خۆر | | خۆراک |
| بڕین | بڕ | ەگە | بڕگە |

### ٢.٥.١٠.٤ لە قەدا چاوگ بۆ ناڤێن نویێ: مینا

| چاوگ | قەدا چاوگ | پاشگر | ناڤا نوێ |
|---|---|---|---|
| بژاردن | بژارد | | بژاردە |
| پالافتن | پالافت | ە | پالافتە |
| گوتن | گوت | | گوتە |
| کوشتن | کوشت | | کوشتار |
| کردن | کرد | ار | کردار |
| گوتن | گوت | | گوتار |
| کردن | کرد | ەوە | کردەوە |
| خاردن | خارد | ەمەنی | خاردەمەنی |
| سووتان | سووت | | سووتەمەنی |
| تەقین | تەق | | تەقەمەنی |

### ٢.٥.١٠.٥ لە چاوگ بۆ ناڤا جێگە

| چاوگ | ڕەگا چاوگ | پاشگر | ناڤا نوێ |
|---|---|---|---|
| لەوەڕین | لەوەڕ | | لەوەڕگە |
| ڕوانین | ڕوان | گە | ڕوانگە |
| فڕین | فڕ | | فڕگە |
| کێلان | کێل | | کێلگە |
| پەرستن | پەرست | | پەرستگە |
| فرۆشتن | فرۆش | | فرۆشگە |
| خوێندن | خوێند | | خوێندنگە |

## ٢.٥.١٠.٦ لە چاوگ بۆ ناڤا ئامێر/کەرەستە

| چاوگ | ڕەگا چاوگ | پاشگر | ناڤا چاوگ |
|---|---|---|---|
| کوتان<br>بڕین | کوت<br>بڕ | ەک | کوتەک<br>بڕەک |
| پێچان | پێچ | ک | پێچک |
| پێچان | پێچ | کە | پێچکە |
| فڕین | فڕ | ۆکە | فڕۆکە |
| گیران | گیر | ە | گیرە |
| بەفرمالین<br>دەستکێشان<br>دەستهاڕین<br>دەستشۆردن<br>ملپێچان<br>بەریەستن<br>دووربینین | بەفرمال<br>دەستکێش<br>دەستهاڕ<br>دەستشۆر<br>ملپێچ<br>بەریەست<br>دووربین | ++++ | بەفرمال<br>دەستکێش<br>دەستهاڕ<br>دەستشۆر<br>ملپێچ<br>بەریەست<br>دووربین |

# ٢.٦ ژمارە

ژمارە بەپێی چەندایەتی و پلەی بەراوردکاری/هەمبەرکردی بۆ سێ جۆر دێتە دابەش کردن. ژمارە تەنها بۆ ئەڤ سێ جۆرە دێتە دابەشکردن:

## ٢.٦.١ ژمارەی بنجی مینا:

یەک، دوو، سێ، چار، پێنج، شەش، حەفت، هەشت، نۆ، دە، یازدە، دوازدە، سێزدە، چاردە، پازدە، شازدە، حەڤدە، هەژدە، نۆزدە، بیست، بیست و شەش، سی، سی و یەک، چل، چل و نۆ، پەنجا، شێست، حەفتا، هەشتا، نەوەد، سەد، سەد و بیست و یەک، سێ سەد، سێ سەد و پەنجا و چار، هەزار، سێ هەزار، چار هەزار و پێنج سەد چل و حەفت، ملیۆن، ملیارد.

## ٢.٦.٢ ژمارەی پلەیی:

ژمارەی پلەیی لە رێگەی پترکردنا (+ ەم[٣٤]، + ەمین) دێتە چێ بوون، مینا:
یەکەم- یەکەمین، دووەم- دووەمین، سێهەم- سێهەمین، چارەم + چارەمین، پێنجەم- پێنجەمین، دەهەم- دەهەمین، سەدەم- سەدەمین، هەزارەم- هەزارەمین.

---

34 ژمارەی پلەیی بۆ وان ژماران کو بە نەبزوێن کۆتایی دێ، /ەم/ زێدە دەکرێ لێ بۆ وان ژماران کو بە بزوێن دوماهی دێ، /هەم/ زێدە دەکرێ مینا: دە- دەهەم، سێ — سێهەم.

### ٢.٦.٣ ژمارەی کەرتی:

سێ یەک، چار یەک، پێنج یەک، هەشت یەک، لە دە پێنج، لە سەد دە، لە هەزار دوو.

نموونەی ژمارە لە ڕستە:

| ژمارەی بنجی | ژمارەی پلەیی | ژمارەی کەرتی |
|---|---|---|
| من دوو خانی هەیە.<br>ئازاد چل مانگا هەیە.<br>شەرمین هەشت لیرە هەیە. | لە پێشبرکێی تۆپا پێ، تیما کوردستان یەکەم بوو.<br>ئازاد پلەی سێهەم لە پولا خۆ بەدەست هێنا. | بلا سێ لە چارا قازانج بۆ من بێ.<br>ئازاد یەک لە پێنجا قەرزا خۆ نەدایە.<br>یەک لە چارا دانیشتوانا عێراق کوردە. |

## ٢.٧ ئامرازێن یەکگرتی

یەکگرتن بە واتای "گرێدانا" دوو یەکە دێ لە کۆنتێکستەکا ڕێزمانی. ئامرازێن یەکگرتی لە حەفت وشە پێک هاتییە: و، بەلام/لێ، لەگەل، نە+ و+ نە، یان+ یان، یان، هەم+ و+ هەم[٣٥].

| ئامرازێن یەکگرتی | ڕستە |
|---|---|
| و | ئازاد و نەوزاد چوون بۆ بازێڕ. |
| بەلام/لێ | ئازاد چوو بۆ بازێڕ لێ/بەلام نەوزاد چوو بۆ مال. |
| لەگەل | من لەگەل ئازاد چووم بۆ بازێڕ. |
| نە-و — نە | نە من و نە ئازاد وسا نەگوتییە. |
| یان — یان | یان ئازاد یان تو لە قوتابخانە بە یەکەم دەردەچێ. |
| هەم — هەم | هەم من هەم تو لە قوتابخانە سەردەکەفین. |

[35] بۆ ئامرازێن یەکگرتی ڤان چەمکان هاتییە بەکارهێنان: عەتف، لێکدەر، یەکخەر، پەڤگرێک، پێبەست، پێوەند و بەستنەوە. بنەڕە ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی (٢٠١١: ٢٧٣).

# ٢.٨ ئامرازێن پێشبەند

پێشبەند "پێش + بەند" بە واتای پێش وشە دێ کو ئەڤ وشە لەگەل ڕستە پەیوەست دەکا. وشەێن پاش ئامرازێن پێش بەند ناڤە. ئامرازێن پێشبەند لە سادە و لێکدراو پێک هاتییە. پێشبەندێن سادە بریتییە لە: بۆ، بە، بێ، لە "ل/ژ/د"، پێش، پاش[٣٦][٣٧].

## ٢.٨.١ ئامرازێن پێشبەندا سادە

| پێشبەند | ڕستە |
|---|---|
| بە | من بە کەفچک نیسک خوارد. |
| بێ | ئەز ناڤێ بێ تو بژیم. |
| بۆ | من بۆ ئامەد دەچم. |
| پێش | ئازاد پێش نەوزاد هات. |
| پاش | ئازاد پاش نەوزاد هات. |
| لە | من لە سلێمانی هاتم. |
| تا | من تا جەلەولا دەڕۆم. |
| مینا/وەک | شارا خانەقین وەک/مینا قەسری شیرین جوانە. |

---

[36] بۆ ئامرازێن پێشبەند ڤان چەمکان هاتییە بەکارهێنان: پریپۆزیشن، ئەدات، بەرناڤ، پێربەست و پەیوەندی. بنەڕە ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی (٢٠١١:٢٥٧).

[37] بەپێی پێشنیارێن فۆنۆلۆجی، (١.١.١) خالا ٩، باشترە ئامرازا پێش بەندا /لە/ لە شوونا "ل، ژ، د" لە زمانا فەرمی بێتە بەکارئینان؛ واتە نەپێویستە/نەپێدڤییە /ل/، /ژ/ و /د/ لە زمانا فەرمی بێتە بەکارئینان.

## ٢.٨.٢ ئامرازێن پێشبەندا ناسادە

خشتەی ژێرڤە ئاماژە بە هەندەک ئامرازێن پێشبەندا ناسادە یان لێکدراو دەکا:

| | | | |
|---|---|---|---|
| لە ژێر | لە پێش | لە ناوەڕاست | بە بێ |
| لە ژوور | لە هەمبەر | لە نێوەند | بە پێی/ لە گوێ |
| لە بان | لە بەرامبەر | بە نێوەند | لە بری |
| لە بن | لە ناڤ | بە ئاراستەی | لە شوونا/جیاتی |
| لە کن | لە نێوان | بە لای | لە هەر سێ لا |
| لە لا | لە دەورووبەری | بە ژێر | لە هەر چار لا |
| لە پاش/دوا | لە ناڤین | بە دوا | لە شوونا/جێگەی |

# ٢.٩ ئامرازێن پاشبەند

پاشبەند "پاش+ بەند" لە پاش وشە "ناڤ، جێناڤ و هەڤالکردار" دێتە دانان. پاشبەند لە ڕوانگەی ژمارە و واتا سنووردارە و ئەرکا ڕێزمان ژی نییە. ئامرازێن پاشبەند لە سێ دانە پێک هاتیە[38]: دا، ڤە و ژی[39]:

| ئامرازا پاشبەند | نموونە |
|---|---|
| دا | لە ڕاستیدا، لە بناغەدا، لە هەولێردا هتد. |
| ڤە | ژێرڤە، پاشڤە، ژوورڤە، دوورڤە، نزیکڤە هتد. |
| ژی | منژی، ئازادژی، ئەوانژی، هەولێرژی هتد. |

[38] لەگوڕ/بەپێی ئاگاداریی من هیچ نووسەرەک باس لە ئامرازا پاشبەند نەکردییە.

[39] لە ک.خ. پاشبەندێن /ڤە/ و /ژی/ نییە بەلکو لە شوونا وان /ەوە/ و /یش/ هەیە. من /ڤە/ و /ژی/ هەلبژارد چونکە دەنگێن /ڤ/ و /ژ/ پتر لە کوردی دێتە بەکارئینان تاکو لە زمانا فارسی. ئەڤ دوو دەنگە لە عەرەبی و تورکی نییە. لە ڕاستیدا گەلەک جار هەردوو دەنگێن /ڤە/ و /ەوە/ وەک پاشبەند پێدڤی نییە بۆ نموونە: لە هەولێرڤە تا دهۆک. لە کەلارەوە تا سلێمانی. لە زمانا نووسین/فەرمی دەبێ مرۆڤ بێژێ/بنووسێ: لە هەولێر بۆ دهۆک، لە کەلار بۆ سلێمانی.

دیسان پاشبەندی /ڕا/ لە هەردوو دیالێکتێن ک.ژ. و ک.خ. دێنە گوتن لێ من ئەڤ پاشبەندە بۆ زمانا فەرمی پەسەند نەکردییە چونکە زێدەیە.

چەک و سیلاح ژ منڕا بینن. ئەوی ژ برێ خوەڕا کاغەز نڤیسی. (قەناتی کوردۆ ٦١:١٩٩٠).

کەریم لە کتێبخانەرا کتێبی هێنا. (ئەحمەدی قازی ٦٧:١٣٦٧).

لە سلێمانی ڕا، لە هەولێرڕا (د. ئەورەحمانی حاجی مارف ١٦٢:١٩٩٨) ژمارە و ئاوەڵکردار، بەشی چوارەم.

مە ژی وە ڕا گۆشت کڕین. بۆ زمانا فەرمی دەکری ئەڤە بێتە نووسین: ئێمە بۆ ئێوە گۆشت کڕی.

## ٢.١٠ ئامرازێن گەیەنەر

ئامرازێن گەیەنەر پتر بۆ گرێدانا ڕستەی ناسەرەکی لەگەل ڕستەی سەرەکی دێتە بەکارهێنان[40]. بنەڕە خشتەی ژێر ڤە:

| ئامرازێن گەیەنەر | ڕستە |
|---|---|
| وەک | وەک تو، من ژی دەچم. |
| نەک | لەز/پەلە نەکە ئەگەر نا دەکەفی. |
| ئەگەر | ئەگەر تو بچی، من ژی دەچم. |
| هێند | نەسرین هێند گریا تا بێهۆش کەفت. |
| چقاس/ئەوقاس | ئێمە چقاس کار بکەین ئەوقاس ژی قازانج دەکەین. |
| ئەمەندە | من ئەمەندە پارە هەیە کو خانییەک بکرم. |
| ئەوەندە/هێندەی | ئەوەندەی تو، من پارە هەیە. |
| چونکە | ئەوێ نەهات چونکە نەخۆش بوو. |
| هەرچەند | هەرچەند من تو دەبینم، دلشاد دەبم. |
| لەوما/بۆیە/لەوڕا | ئازاد نەهات، بۆیە نەوزاد ژی نەهات. |
| لەبەرئەوەی | ئازاد نەهات لەبەرئەوەی نەخۆش بوو. |
| کەنگێ/کاتێ/گاڤا | کەنگێ بەهار بێ گول دەپشکڤن. |
| هەنگێ | هوون هەنگێ ئازاد دەبن کو خودانا ولات بن. |
| کو[41] | ئەڤ پارە کو تو بلاڤ دەکەی، سامانا میلەتە. |
| چۆن/چەوا | چۆن/چەوا هاتی وسا بزڤڕە. |
| بەلکو | بەردەوام بە، بەلکو ئەوان باوەڕ بە تو بهێنن! |
| بەشکو | بەردەوام بە، بەشکو ئەوان باوەڕ بە تو بهێنن! |
| داکو | مەشق بکە داکو سەربکەفی! |

40 لەگۆڕ ئاگادارییی من هەتا نها/ئێستا ئامرازا گەیەنەر وەک بەشەکا/پشکەکا جیاکردی و سەرەکی ڕێزمان نەهاتییە خەملاندن.

## ٢.١١ ئامرازێن سەرسوڕمان

ئامرازێن سەرسوڕمان بۆ چار جۆر دێتە دابەشکردن[٤٢]:

| هەستا خۆشی و گالتەجاڕی | هەستا سەرسوڕمان و ناڕازیی بوون: | هەستا پەژارەیی و دلّتەنگی | بانگکردن |
|---|---|---|---|
| دەک | وای | داد و بێداد | هۆ هۆ! |
| هاها | ئیو/عیو | ئای/ئوی | فلان! فیسار!بیڤار! |
| هەی هەی | هەک/دەک | ئاخ و داخ | کابرا! |
| ئۆخەی | پەک/پەکو | حەیف | کوڕۆ! بابۆ! |
| | هەی/هەیهو/هەیها | ئۆف | کچێ! خوشکێ! |
| | پەح | | خزمینە! کوڕینە! |

ئامرازا بانگکردن بۆ نێر بە دەنگا /ۆ/ کۆتایی دێ، بۆ مێ بە /ێ/ کۆتایی دی و بۆ کۆ بە /ینە/ کۆتایی دێ[٤٣].

---

41 لە ک.خ. ئامرازا گەیەنەر /کە/ دێتە بەکارهێنان، بۆ نموونە: ئەو پارە کە تۆ بلاّوی دەکەی، سامانی میلەتە.

42 بۆ ئامرازێن سەرسوڕمان ڤان چەمکان هاتییە بەکارهێنان: ترجي، تعجب و ئالاڤی هێڤی. بنەڕە ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی (٢٠١١:٣٤٩).

43 لە ک.ژ. و ک.خ. ئامرازا بانگکردن بۆ مێ بە دەنگا /ێ/ کۆتایی دێ. ئامرازا بانگکردن بۆ نێر لە ک.ژ. بە /ۆ/ کۆتایی دی و لە ک.خ. بە دەنگا /ە/ کۆتایی دێ. ئامرازا بانگکردن بۆ کۆ لە ک.ژ. بە /ئینۆ/ کۆتایی دێ بۆ نموونە: هەڤالینۆ، براینۆ. ئامرازا بانگکردن بۆ کۆ لە ک.خ. بە /ئینە/ کۆتایی دێ بۆ نموونە: هەڤالینە. براینە. مەبەست لە هەلبژاردنا سێ دەنگ لە کۆتایی وشەێن بانگکردن تەنها بۆ ئاسانتر جوداکردنا بانگکردنا مێ. نێر و کۆ یە. دەنگێن /ین/ دەکرێ وەک هێما بۆ کۆ بێتە خەملاندن و دەنگا /ە/ ژی وەک هێما بۆ دەستنیشانکردن: هەڤالینە، کوڕینە، مەردینە هتد.

## ٣.١ شێوە، ئەرک و واتا

ئێمە بە ئاستێن جودا جودای زمان دەبێژین شێوە، مینا **ناڤ**، **جێناڤ**، **هەڤالناڤ** **هتد**. لە لایەکی دن، پشکێن ڕستە، کو لە ڤان ئاستان پێک هاتییە، ئەرکا جودا دەبینن. وشەی وەک زارۆک و شیر هەردەم **ناڤ**+ە لێ لە ئەڤ ڕستە "زارۆک شیر دەخوا" "زارۆک" بکەرە بەلام "شیر" بەرکارە. هەلبەت بکەر و بەرکار بە پەیوەندی لەگەل کردار دێتە تێگەیشتن لێ ئەڤە هەموو ڕاستییەک نییە. لە ڕستەی "**شیر هاتە خوارنەڤە لە لایەن زارۆکەڤە**" وشەی "شیر" لە چوارچێوەی "واتا" سێمانتیک بەرکارە بەلام لە چوارچێوەی سینتاکسدا "بکەر"ە. هەلبەت خوێنەر جیاوازی لە ناڤ ڕستەی یەکەم، کو چالاکە، و دووەم، کو ناچالاکە، دەکا. لەوما خوێنەر دەبێ جیاوازی لە ناڤبەرا شێوە (ئاستا زمان)، ئەرک (ئەرکا ڕێزمانی لە ڕستە) و واتا (واتای وشە لە ڕستە) بکا.

ڕستە بە ڕیزەک وشە دەگوترێ کو لە پاش یەکدی هاتبن و یەکەیەک چی بکەن[٤٤]. لە ڕستە ڕۆلا (بکەر، بەرکار هتد.) دیارە. ڕستە لە ڕوانگەی پێکهاتەی ڕێزمانی وەک "تشتەک کو سەبارەت بە بکەر هاتیە گوتن" یان تشتەک ***گوزارشت*** لە بکەر دەکا دێتە ناسین. من هێدی هێدی و بە کورتی باس لە ڤان ئەرکان دەکەم.

| ئەرکێن ڕێزمانی |
|---|
| • بکەر |
| • کردار |

[44] بۆ وشە ڤان چەمکان دێتە بەکارهێنان: واژە، پەیڤ و کلمە. بۆ ڕستە ڤان چەمکان دێتە بەکارهێنان: هەڤۆک و جملە.

- تەواوکەر
  - بەرکار
    - بەرکارا ڕاستەوخۆ
    - بەرکارا ناڕاستەوخۆ
  - تەواوکەرا گوزارەیی
    - پەیوەست بە بکەر
    - پەیوەست بە بەرکار
    - پەیوەست بە کردار

### ٣.١.١ بکەر

بکەر ئاماژە بە ئەو یەکە (زیندەوەر یان تشت) دەدا کو کارەک چی دەکا یان چێ کردیە و لە لایەن کردار هاتیە دیاریکردن. بکەر لە ڕستەێن ژێرڤە بە لاری هاتیە نووسین:

***پۆلیس*** دزەکە گرت.

***من*** نان خێرا خوارد.

***ئەو ڕەزڤانە دلسۆزە*** زەوی ئاڤدا.

لە ڕستەێن سەرڤە بکەر کردەوەی فیزیکی چی دەکا. لێ لە ڕستەێن ژێرڤە بکەر هیچ کردەوەیەک چێ ناکا بەلکو کردار گوزارشت یان باس لە پەسەن/خەسلەتا بکەر دەکا:

***دادگاێن ڕۆژهەلاتا ناڤین*** سەربەخۆ نین.

*ئازاد* له دەنگا کاوێز ئاغا حەز دەکا.

*بەهارا کوردستان* گەلەک ڕەنگینە.

بکەر دەکرێ له تەنها یەک وشه پێک هاتبێ بەلام دەکرێ له گرێیەکا ناڤی ژی پێک هاتبێ، مینا (ئەو ڕەزڤانه دلسۆزە، داگاێن ڕۆژهەلاتا ناڤین و بەهارا کوردستان). بکەر دەکرێ ناڤ، جێناڤ یان ژی گرێیەک بێ.

## ١.٢.٣ کردار

پۆلیس دزەکه *گرت*.

من خێرا نان *خوارد*.

دادگاێن ڕۆژهەلاتا ناڤین سەربەخۆ *نەبوون*.

ئازاد له دەنگا کاوێز ئاغا *حەز دەکا*.

له هەموو نموونەێن سەرڤه کردار گوزارشت له کردەوە، ڕووداو/بویەر، ڕەوش یان پڕۆسەیەکا هزری (هەست کردن، بیرکردنەڤە، دیتن، بیستن) دەکا.

## ٣.١.٣ بەرکار

بەرکار به ئەو زیندەوەرە، تشته یان یەکه دەگوترێ کو دەکەڤێته ژێر کردەوەی بکەر. ئەگەر له ڕسته بەرکار هەبوو، هەنگێ کردارا ڕسته تێپەڕە. بەرکار دەکرێ یەک وشه بێ یان وەک گرێیەکا پێشبەند بێته نیشان دان. بەرکار دەکرێ جێناڤ ژی بێ لێ جێناڤ هەردەم له پاش بکەر دێ. بەرکار دەکرێ ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ بێ:

### ⮚ بەرکارا ڕاستەوخۆ:

پۆلیس <u>دزەکە</u> گرت.

ئەوێ بە <u>من</u> گوت.

من <u>*نان*</u> خێرا خوارد.

ئازاد <u>*لە دەنگا کاوێز ئاغا*</u> حەز دەکا.

میڤان <u>نان</u> خوارد. (نان هاتە خواردن)

هەندەک خەسلەتا/پەسنا بەرکارا ڕاستەوخۆ:

- ئاماژە بە کەسەک، تشتەک یان یەکەیەک دەدا کو دەکەفێتە ژێر کاریگەری بکەر.
- دەکرێ وەک گرێ — یەکا ناڤی بێتە نیشان دان.
- لە ڕستەی ناچالاک ڕۆلا بکەر هەنە (ڕستەی ٥).

### ⮚ بەرکارا ناڕاستەوخۆ

ئازاد چەپکەک *گول* (١) بە *نەسرین* (٢) پێش کەش کرد.

ئەوان *زارۆکێن* خۆ (١) بە *من* (٢) سپارد.

من پەرتوکەکە (١) لە چاپخانە (٢) وەرگرت.

دەولەتا نەژادپەرستا عێراق نەتەوەی کورد (١) بە چەکا کیمیایی (٢) تۆپباران کرد.

هەندەک خەسلەت/پەسنا بەرکارا ناڕاستەوخۆ:

- ئامازە بە زیندەوەر، تشت یان یەکە دەکا کو وەکو ئارمانجا یان دەرئەنجاما کردەوەی بکەر دێنە دیاریکردن.
- دەکرێ لە پاش یان لە پێش بەرکارا ڕاستەوخۆ بێ.
- لە پاش ئامرازێن پێش بەند دێن.
- دەکرێ وەکو گرێی ناڤی بێنە نیشان دان.

## ٣.١.٤ تەواوکەرا گوزارەیی

زانیاری زێدەتر دەربارەی بکەر، بەرکار یان کردار نیشان دەدا:

### ٣.١.٤.١ تەولوکەرا بکەر

ئازاد، مینا نەناسەک، لەگەل من دەئاخفت.

نەسرین، کو ڕێڤەبەرا دەزگای وەشان و چاپەمەنی پایتەختا هەرێما کوردستانە، دۆتماما منە.

ڤان گوندان، کو دەولەتا داگیرکەرێن کوردستان کاولکرد، کوردیی بوون.

هەندەک خەسلەت/پەسنا تەواوکەرا بکەر:

- زانیاری نوێ و زێدە سەبارەت بە بکەر نیشان دەدا.
- وەک گرێی هەڤالکرداری دێتە نیشان دان.
- وەک ڕستەی هاریکار دێتە چێکردن.

### ٣.١.٤.٢ تەواوکەرا بەرکار

من، مافا خۆ، کو لە لایەن داگیرکەران هاتیە زەفت کردن، دەستینم.

هەندەک خەسلەت/پەسنا تەواوکەرا بەرکار:

- زانیاری نوێ سەبارەت بە بەرکار نیشان دەدا.
- وەک گرێی هەڤالکرداری دێتە نیشان دان.
- وەک ڕستەی هاریکار دێتە چێکردن.

### ٣.١.٤.٣ تەواوکەرا کردار

تەواوکەرا کردار ئاماژە لە چلۆنایەتی ئەو کردوە دەکا کو هاتیە ئەنجامدان یان دێتە ئەنجام دان لە لایەن بکەرڤە. هەلبەت هەڤالکردار وەک تەواوکەرا کردار دێتە ئەژماردن.

ئازاد *گەلەک بە خێرایی* چوو.

زارۆکەکە *هێدی هێدی* ڕازا.

## ٣.٢ گرێ

گرێ دەکرێ بریتی بێ لە تەنها وشەیەک یان لە هەندەک وشە کو لەگەل وشەیەکا سەرەکی پەیوەست بن. وشەی سەرەکی دەکرێ ناڤ، جێناڤ، هەڤالناڤ، هەڤالکردار، کردار و پێش بەند بێ. جۆرێن گرێ بریتییە لە:

### ٣.٢.١ گرێی ناڤی:

پۆلیس دزەکە گرت.

من نان خێرا خوارد.

دادگاێن رۆژهەلاتا ناڤین سەربەخۆ نەبوون.

ئازاد لە دەنگا کاوێز ئاغا حەز دەکا.

بەهارا کوردستان گەلەک ڕەنگینە.

دەولەتا نەژادپەرستا عێراق نەتەوەی کورد بە *چەکا کیمیایی* تۆپباران کرد.

وشەێن سەرڤە کو هێل هاتیە بەژێردا گرێی ناڤین. گرێی ناڤی دەکرێ یەک وشە بێ، مینا ناڤ یان جێناڤ، یان کۆمەلەک وشە بێ کو لەگەل یەک وشەی سەرەکی پەیوەست بن. گرێی ناڤی دەکرێ ڕۆلا بکەر و بەرکار لە ڕستە هەبێ.

لە ڕستەی چارەم و شەشەم دوو گرێی پێشبەندی هەیە: لە دەنگا کاوێز ئاغا و بە چەکا کیمیایی. هەلبەت ئەگەر ئامرازا پێشبەندا لە و بە لە ڤان دوو گرێیان بێتە لابردن، هەنگێ دوو گرێی ناڤی دەمێنن.

## ۳.۲.۲ گرێی کرداری:

ئازاد چەپکەک *گول* بە *نەسرین* پێش کەش کرد.

ئەوان *زارۆکێن* خۆ بە من سپاردن.

پێشەوا قازی محەمەد وەک سەرکردەیەکا دێروکی دێتە ناس کردن.

دەولەتا نەژادپەرستا عێراق نەتەوەی کورد بە چەکا کیمیایی تۆپباران کرد.

وشەێن ڕستەێن سەرڤە کو هێل هاتیە بە ژێردا گرێی کردارین. گرێی کرداری دەکرێ لە یەک یان پتر وشە پێک هاتبێ. هەلبەت دەستەواژەی کرداری وەک گرێی کرداری دێتە ژماردن (بنەڕە دەستەواژەی کرداری ۲.۵.۹).

### ٣.٢.٣ گرێی هەڤالنافی

دەولەتا نەژاد پەرستا عێراق نەتەوەی کورد بە چەکا کیمیایی تۆپباران کرد.

بفەرموو، نانەکا گەرم و نەرم بخۆ!

وشەێن ڕستەێن سەرڤە کو هێل هاتیە بە ژێردا گرێی هەڤالنافین. گرێی هەڤالنافی دەکرێ لە یەک یان پتر وشە پێک هاتبێ.

### ٣.٢.٤ گرێی هەڤالکرداری

ئازاد گەلەک بە خێرایی چوو.

زارۆکەکە هێدی هێدی ڕازا.

ئازاد بە لەز چوو.

وشەێن ڕستەێن سەرڤە کو هێل هاتیە بە ژێردا گرێی هەڤالکردارین. گرێی هەڤالکرداری دەکرێ لە یەک یان پتر وشە پێک هاتبێ.

### ٣.٢.٥ گرێی پێشبەندی

ئازاد لە دەنگا کاوێژ ئاغا حەز دەکا.

ئازاد گەلەک بە خێرایی چوو.

ئازاد بە لەز چوو.

ڤان وشان لە ڕستەێن سەرڤە کو هێل هاتیە بە ژێردا گرێی پێشبەندین. گرێی پێشبەندی لە دوو وشە یان پتر پێک دێ.

## ٣.٢ ڕسته

ڕسته به کۆمەلەک وشه دەگوتریّ کو له پاش یەکدی هاتبنه ڕیزکردن و واتای تەواو و سەربەخۆ بدا. هەلبەت وشەیّن ڕسته به هەرەمەکی نایەنه ڕیزکردن، بەلکو بەپیّی ڕیّسای ڕیّزمانی دیّنه ڕیزکردن. ڕسته به خال کۆتایی دیّ[٤٥] [٤٦].

هەندەک خەسلەتیّن/پەسنیّن ڕستەیّن کوردی:

- بکەر هەردەم له پیّش کردار دیّ.
- بکەر هەردەم له پیّش بەرکار دیّ.
- بەرکار هەردەم له پیّش کردار دیّ.
- (تەواوکەر) هەڤالکردارا شویّنی و دەمی دەکریّ پیّش یان پاش بکەر و کردار بیّن.

ڕسته بەپیّی ئەڤ خشتەیە دیّته دروست کردن؛ بۆ نموونه:

دویّنیّ من به لەز نامەکه به ئازاد دا.

---

[45] وشەی "ڕسته" له چاوگا "ڕستن" هاتییه و له لایەن پرانی کوردان دیّته بەکارهیّنان. له ک.ژ. "هەڤۆک" ژی دیّته بەکارهیّنان. له ئیّره "ڕسته" به واتای ڕیزکردنا ژمارەک له وشه دیّ به مەبەستا دەربڕینا بیرۆکەیەک یان ناڤەڕۆکەک.

[46] پرانی ڕستەیّن کوردی کو به ڕیّنووسا عەرەبی هاتییه و دیّنه نووسین ڕەنگڤەدانا زمانا قسەکردنه. ئاساییانه تیّکستەکا نووسراو له هەندەک پارچه تیّکست دیّته چیّکردن. هەر پارچه تیّکستەک ژی له هەندەک ڕسته دیّته دروستکردن. هەلبەت ڕسته، نەمازه ڕستەی ڕاگەیاندن، به لایەنی کێم له بکەر و بەرکار پیّکهاتییه لیّ گەلەک جاران بکەر له ڕسته نایەته نووسین. دیسان گەلەک جاران یەک پارچه تیّکست له یەک ڕستەی گەلەک دریّژ پیّک هاتییه. له ڤان ڕستان شیکارکردن گەلەک دژوار دەبیّ (بنەڕه شیکارکردن ٣.٥).

| تەواوکەر[47] | بکەر | تەواوکەر | بەرکار | بەرکار | کردار | تەواوکەر |
|---|---|---|---|---|---|---|
| دوێنێ | من | بەلەز | نامەکە | بە ئازاد | دا | |
| | من | بەلەز | نامەکە | بە ئازاد | دا | دوێنێ |
| بەلەز | من | | نامەکە | بە ئازاد | دا | دوێنێ |

**لە ڕستە شوونا/جێی بکەر، بەرکار و کردار نایەتە گۆڕین.**

ڕستە لە ڕوانگەی چلۆنایەتی و پێکهاتەڤە بۆ دوو جۆر دێتە دابەشکردن:

## ٣.٣.١ ڕستە لە ڕوانگەی چلۆنایەتی

ڕستە لە ڕووی چلۆنایەتی بۆ چار جۆر دێتە دابەشکردن:

### ٣.٣.١.١ ڕستەی ڕاگەیاندن

ڕستەی ڕاگەیاندن زانیاری دەربارەی زیندەوەر یان تشت دەدا. زیندەوەر دەکرێ مرۆڤ یان ئاژەل بێ لێ تشت دەکرێ دەربارەی هەموو تشتێن هەستپێکردی بێ. دیسان تشت دەکرێ دەربارەی بویەر/ڕووداو، باس، هەوال یان هەر دەربڕینەکا دی بێ. ڕستەی ڕاگەیاندن لە هەردوو دەمێن نها و بوری دێتە بەکارهێنان.

ئەڤ سال دەولەتا ئێران ئاڤا ڕووبارا ئەلوەن لە خانەقین وشک کرد.

ئەڤدال لە کرماشان بۆ شرناخ دەچێ.

47 هەلبەت ڕستەی هاریکار ژی وەکو تەواوکەر دێتە ژماردن.

ئازاد نان دەخوا.

حەسەن زیرەک ستران بێژەکا بە ناڤ و دەنگ بوو.

## ٣.٣.١.٢ ڕستەی پرسیاری

لە ڕستەی پرسیاری کەسەک/کەسانەک پرسیار لە کەسەکا/کەسانەکا دی دەکەن. مەبەست لە ڕستەی پرسیاری بە دەستهێنانا زانیارییە. ڕستەی پرسیاری بە نیشانەی پرسیار کۆتایی دێ. ڕستەی پرسیاری لە دەمین نها و بوری دێتە چێکردن. ڕستەی پرسیاری بەپێی بەرسڤ بۆ دوو جۆر دێتە دابەشکردن:

**یەکەم:** ڤان ڕستان، کو بە بەلێ/نەخێر دێنە بەرسڤ دان، دەبێ بە نیشانەی پرسیارا "ئایا" بێنە دەستپێکردن مینا[٤٨]:

ئایا تو ئاڤ دەخۆی؟ بەلێ/نەخێر من ئاڤ نا/دەخۆم.

ئایا هوون نان خوارد؟ بەلێ/نەخێر ئێمە نان نە/خوارد.

ئایا ئەوان بۆ بازێر دەچن؟ بەلێ/نەخێر ئەوان بۆ بازێر نا/دەچن.

ئایا ئێوە بۆ بازێڕ چوون؟ بەلێ/نەخێر ئێمە بۆ بازێر نە/چووین.

**دووەم:** ڤان ڕستان کو جێناڤێن پرسیار بەکاردەهێنن، مینا:

ئەوێ بۆ کوێ دەچێ؟

---

[48] هەلبەت هەندەک وشەی دن ژی دێنە بەکارهێنان مینا: ئەرێ، جا، ئینجا هتد. لە بنەڕەتدا وشەی "ئایا" هیچ ڕۆل و ئەرکا ڕێزمانی نییە. هەرچۆنەک بێ، من وشەی "ئایا" بۆ زمانا فەرمی بە باش دەزانم. ئەڤژی بە مەبەستا ئاسانکاری، ڕێکخستنا ڕێزمانا فەرمی و جوداکردنا زمانا نووسین لە قسە.

تو دڤیا چی بخۆی؟

ئەوان کەنگێ دێن بۆ ئێرە؟

کوردستان بۆ چەند بەش هاتیە پارچە کردن؟

"هوون/ئێوە" بۆچی کاردەکەن؟

### ٣.٣.١.٣ ڕستەی داخوازی

لە ئێرە کەسا یەکەم داوا لە کەسا دووەم تاک/کۆ دەکا بۆ کردنا کارەک یان چالاکییەک، مینا:

هەستە!

هەستن!

بڕۆ!

بڕۆن!

### ٣.٣.١.٤ ڕستەی سەرسوڕمان

ڕستەی سەرسوڕمان، هەروەکو ئامرازێن سەرسوڕمان دەربارەی دەربڕینا هەستێن جیاوازە مینا: هەستا خۆشی و ناخۆشی، گالتەجاڕی، سەرسوڕمان و ناڕازیی، پەژارەیی دڵتەنگی و هتد. دیسان ڕستەی سەرسوڕمان دەکرێ دەربارەی بانگکردن بێ. ئاساییانە ڕستەی سەرسوڕمان لە ڕوانگەی ڕێزمان تەواو نییە، مینا:

هەی هەی!

ئۆخەی!

وای!

ئۆف!

کورۆ! بابۆ!

کچێ!

ئەو کچە چەند جوانە!

وەک دیارە، هەردوو ڕستەی داخوازی و سەرسوڕمان بە نیشانەی سەرسوڕمان کۆتایی دێ.

## ٣.٣.٢ ڕستە لە ڕووی پێکهاتەڤە

ڕستە لە ڕووی پێکهاتەڤە دەکرێ تەواو یان ناتەواو بێ. ڕستەی تەواو واتای تەواو دەبەخشێ بەلام ڕستەی ناتەواو واتای تەواو نابەخشێ. دوو ڕستەی تەواو لە ڕێگەی ئامرازا یەکگرتی دێنە یەکگرتن. مرۆڤ بە ئەڤ جۆرە ڕستە دەبێژێ ڕستەی یەکگرتی.

### ٣.٣.٢.١ ڕستەی سەرەکی

ڕستەی سەرەکی دەکرێ سادە بێ و تەنها لە دوو (بکەر و کردار) یان سێ وشە (بکەر، بەرکار و کردار) پێک هاتبێ، مینا:

من دەچم.

ئازاد دێ.

من نان دەخۆم.

ئازاد مۆز دەخوا.

ڕستە دەکرێ درێژ بێ و لە چەند وشەیەک (بکەر، هەڤالناڤ، بەرکار، کردار، ژمارە، هەڤالکردار، ئامرازا پێش بەند، ئامرازا پاش بەند) پێک هاتبێ، مینا:

هەیڤا پێشوو من دە دولار بە ئازاد دا.

من ژی ڤان سەرکەفتنێن مەزن لە هەموو پیرۆز دەکەم.

من بە دیتنا ڕەشبەلەکا تو گەلەک کەیف خۆش بووم.

بارەگای سەرەکی نەتەوەێن یەکگرتی لە شارا نیویۆرکە.

من بەرسڤا خۆ بە کورتی و ڕندکی دەدەم.

## ٣.٣.٢.٢ ڕستەی هاریکار

ڕستەێن هاریکار لە ڕوانگەی سینتاکس/ڕستەسازی و واتا تەواو نییە. ڕستەی هاریکار دەبێ بە تەواوکەرا ڕستەی سەرەکی. ڕستەی هاریکار وەک گرێ +یەکا هەڤالکرداری بۆ ڕستە دێتە خەملاندن. ئێمە بە ڕستەێن هاریکار دەبێژین **ڕستەێن هاریکاریی هەڤالکرداری**. هەلبەت چەند جۆرێن ڕستەێن هاریکاریی هەڤالکرداری هەنە؛ بۆ نموونە:

- **ڕستەێن هاریکاریی هەڤالکرداریی دەمی/کاتی**: وان وشەێن هەڤالکردار کو دەستنیشانا دەم/ کات دەکەن و دەبن بە سەرەتا بۆ ڕستەێن هاریکار؛ مینا **کاتێ، دەمێ، کەنگێ، پێش، پاش، بەر لە، تاکو:**

تاکو من نەیەم، تو نەڕۆ.

کەنگیٚ خۆر هەلهات، هەموو بۆ کار دەچن.

بەر لە/پێش هاتنا من، ئازاد چوو بوو.

• **ڕستەێن هاریکاریی هەڤالکرداریی شوێنی:** وان وشەێن هەڤالکردار کو دەستنیشانا شوێن/جیٚ دەکەن و دەبن بە سەرەتا بۆ ڕستەێن هاریکار؛ مینا **کویٚ، ئێرە، ئەویٚ:**

تو بۆ کویٚ بچی، من دێم.

تو لە کویٚ بژی، من ژی دەژیم.

تو لە ئێرە بژی، من ژی دەژیم.

• **ڕستەێن هاریکاریی هەڤالکرداریی ئەگەری:** **"ئەگەر"** وشەیەکە کو دەستنیشانا ئەگەر لە ڕستە دەکا و دەبیٚ بە سەرەتا بۆ ڕستەی هاریکار؛ مینا:

ئەگەر من هاتم، تو برۆ!

ئەگەر باران بباریٚ، ئێمە بۆ سەیران ناچین.

ئەگەر ئەوان پرسیار هەنە، بلا بێژن.

• **ڕستەێن هاریکاریی هەڤالکرداریی هەمبەرکردی/بەراوردکاری:** وان وشەێن هەڤالکردار کو بەراوردکاری لە ناڤبەرا دوو کەسان یان تشتان لە ڕستە دەکەن و دەبن بە سەرەتا بۆ ڕستەێن هاریکار؛ مینا **وەک، هەروەک**، مینا:

تو خراپ کار دەکەی، هەروەک نەزانەک.

وەک زالمەک، خراپەکاری نەکە!

پارەکە بۆ ئەوی حەلالە، هەروەک شیرا دایکا خۆ.

• **ڕستەێن هاریکاریی هەڤالکرداریی هۆکاری:** وان وشەێن هەڤالکردار کو دەستنیشانا هۆکاربوون لە ڕستە دەکەن و دەبن بە سەرەتا بۆ ڕستەێن هاریکار؛ مینا **لەبەرئەوەی، چونکە، داکو:**

لەبەر ئەوەی دنیا سارد بوو، ئازاد ئاگرەک چێکرد.

ئازاد لە پێشبڕکێکە پشکدار نەبوو، چونکە "ئەوی" نەخۆش بوو.

• **ڕستەێن هاریکاریی هەڤالکرداریی دانپێهێنەری:** وان وشەێن هەڤالکردار کو دەستنیشانا دانپێهێنان لە ڕستە دەکەن و دەبن بە سەرەتا بۆ ڕستەێن هاریکار؛ مینا **هەرچەندە، تەنانەت، تەنانەت ئەگەر:**

ئازاد هەر چەندە بێژێ، من بە قسەی ئەوی ناکەم.

هەرچەندە تو زازا و من ژی لوڕ، لێ ئێمە هەردوو کوردین.

• **ڕستەێن هاریکاریی هەڤالکرداریی دیارخەری:** "کو" وشەیەکە کو دەبێ بە دیارخەر و سەرەتا بۆ ڕستەی هاریکار:

ئازاد، کو خوێندکارا زانکۆیە، بە شەڤان کاردەکا.

هەڤالا من، کو لە کرماشان دەژی، ئەندازیارە.

وشە کەرەستەیەکا زمانییە، کو لە بڕگەیەک یان زێدەتر پێکهاتییە.

## ۳.۳.۲.۳ ڕستەی یەکگرتی

ڕستەی یەکگرتی بریتییە لە یەکگرتنا دوو ڕستەی سەرەکی. بۆ زانیاری زیاتر بنەڕە ئامرازێن یەکگرتی (۲.۷).

ئازاد چوو لێ من هاتم.
ئازاد نان دەخوارد و ئێمە ژی تەماشای تەلەفیزیۆن دەکرد.
ئەگەر تو حەز دەکەی وەرە لێ/بەلام ئەگەر حەز ناکەی نەیە.

## ٣.٤ ڕستەی نەرێنی

نەرێنی دەکرێ بۆ هەردوو ڕستەی سەرەکی و هاریکار بێتە بەکارهێنان. هەر چار جۆرا ڕستەێن کوردی دەکرێ بێنە نەرێنی کردن. بۆ نەرێنی کردنا ڕستە دەکرێ ڤان وشان بێنە بەکارهێنان: **نە، نا، تووجار/هەرگیز، هیچ کەس، هیچ ئاژەل، هیچ زیندەوەر و هیچ تشت.**

ئەڤدال بۆ زاخۆ ناچێ.
ماستا هەولێر ترش نییە.
ئەگەر تو نەساخی، نەچۆ بۆ قوتابخانە!
من گەلەک کارکرد لێ هیچ قازانج نەکرد.
ئەو پیاوە چەند نامەردە!
ئایا تو ناچی بۆ بازێڕ؟
ئەوێ قسەی وسا تووجار نەگوتییە.

## ٣.٥ شیکارکردن

ئەڤ تێکستە لە مالپەڕا "رێڤەبەریا گشتی یا ساخلەمیا پارێزگەها دهۆکێ" لە هەرێما کوردستان لە بەروارا ٢٠١١.١١.٠٧ هاتییە وەرگرتن. هەلبەت من هەندەک گۆڕانکاری لە ئەڤ تێکستە کردییە[٤٩].

---

[49] تێکستا مالپەڕ بێ گۆڕانکاری:

بو یەکەم جار شاندەکا نوژدارێن ئەلمانی گەهشتنە پارێزگەها دهوک

ل گورەی وان بزاڤ و چالاکێن رێڤەبەریا گشتی ساخلەمیا پارێزگەها دهوکێ ژبو گەهاندنا باشترین چارەسەری بو خەلکێ کوردستانێ و بتایبەت بو خەلکێ پارێزگەها دهوک تیمەکێ نوژدارێن بسپور ل وارێ نشتەرگەریا جوانکاریێ ل وەلاتێ ئەلمانیا دەست بکارێ خو کرن و ئەڤرو نێزیکی ( ٥٠ ) نەخوش هاتنە پشکنین و بریار ئەوە کو یا پێتڤی بو ڤان نەخوشا بهێتەکرن وەک دەرمان یان ئەنجامدانا کریارێن نشتەرگەری د. ئەلمونتی گوت ئەز وەک سەروکی شادی پشتی مە نەخوشخانا سوتن و نشتەرگەریا جوانکاریێ ل پارێزگەها دهوک دیتی ل دیڤ هزارا مە نە دەرکەت مە گوت دێ چین و نەخوشخانەکا زور یا بچویکە و چ کار تێدا ناهێتەکرن لێ بەروڤاژی ڤێ ڤێ چەندێ دەرکەت و مە دگەل خو ئینااینە تیمەکێ تابیەتمەند و دەرمان کەل و پەلێن پێتڤی بو ئەنجامدانا چەند کریارێن نشتەرگەری و هەروەسا ئەڤە دوماهیک جار نابیت و دێ بەردەوامێ دەینە ئەڤی پروگلرگرامی ژ بو خزمەتکرنا خەلکێ کوردستانێ د. عبدالله سعید رێڤەبەرێ گشتی ساخلەمیا پارێزگەها دهوک گوت پشتی هەول و بزاڤێن بەردەوام دگەل ڤان نوژدارا ئەم ب رێک کەڤتین و ئەڤ شاندە بهێتە دهوکێ و مەژی ژ لایێ خوڤە هەمی بەرهەڤی بوان ئامادەکرینە وەکی بەرهەڤکرنا نێزیکی (١٢٠) نەخوشان و نوژدارو کارمەندێن ڤێ نەخوشخانێ بو هاریکاریا وان ژ بو پێشکێشکرنا باشترین خزمەتێن نوژداری بو خەکێ دهوکێ

## بو یەکەم جار شاندەکا نوژدارێن ئەلمانی بۆ پارێزگای دهۆک هاتن

بە هاریکاری رێڤەبەریی گشتیی تەندروستیی پارێزگای دهوک، تیمەکا نوژدارێن پسپور لە بوارا نەشتەرگەریی جوانکاری لە ولاتا ئەلمانیا بۆ دهۆک هاتن. ئەڤ تیمە ئەمرۆ دەست بە کارا خو کرد و پشکنین بۆ نێزیکەی (٥٠) نەخوش کرد. پێدڤی ڤان نەخوشان وەک دەرمان یان ئەنجامدانا نەشتەرگەری دی پاشتر دێتە چێکردن. د. ئەلمونتی سەرۆکا تیم گوتی؛ ئێمە وادەزانی کو نەخۆشخانەی سووتان و نەشتەرگەریی دهۆک بچووکە لێ بە بەروڤاژی هزرا ئێمە دەرکەفت کو ئەڤ نەخۆشخانە نەبچووکە. ناڤبری گوتی کو ئەڤ تیمە تایبەتمەندە و دەرمان و کەل و پەلێن پێدڤی بۆ ئەنجامدانا چەند جۆران نەشتەرگەری هێنایە. دیسان ئەوی گۆت کو ئەڤ سەردانە دواهەمین نییە، بەلکو هاریکاری و هەڤکاری لە ناڤبەرا ئێمە و نەخۆشخانەی سووتان و نەشتەرگەری دهۆک بەردەوام دەبێ. د. عبدالله سعید رێڤەبەرا گشتی تەندروستیی دهوک گوتی؛ پاش هەول و بزاڤێن بەردەوام لەگەل ڤان نوژداران، ئێمە رێکەڤتین کو ئەڤ تیمە بێن بۆ دهوک. ئەوی گۆت کو نەخۆشخانە، نوژدار و کارمەندێن تەندروستیی دهۆک ئامادەکاری تەواو بۆ هاتنا ئەڤ تیمە کردیە. شایانا گوتنە کو هەڤکاری لە ناڤبەرا ئێمە و دامودەزگاێن تەندروستیی بیانی کارەکی پێدڤییە و ئەڤە دەبێ بە هۆکارا بلندکردنا ئاستا تەندروستی لە کوردستان .

**شیکارکرنا تێکست:**

### ٣.٥.١ ڕوانگەی ژمارە و جۆرێن ڕستە

لە خشتەی ژێرڤە ژمارەی ڕستە، ژمارەی وشە، ژمارە و جۆرێن گرێ، هەروەها ژمارە و جۆرێن ڕستە بۆ هەموو تێکستەکە دێتە دیاریکردن.

گ.ن (گرێی ناڤی)، گ.ک. (گرێی کرداری)، گ.هە (گرێی هەڤالکرداری)، گ.پ (گرێی پێشبەندی)

| ڕستە | ژ.وشە | ژمارە و جۆرێن گرێ | ژمارە و جۆرێن ڕستە |
|---|---|---|---|
| ١ | ٢٠ | گ.پ. (٢)، گ.ن. (١)، گ.ک. (١) | ڕستەی هاریکار (١)، ڕستەی تەواو (١) |
| ٢ | ١٥ | گ.ن. (٢)، گ.ک. (٢)، گ.هە. (١) | ڕستەی یەکگرتی (٢) |
| ٣ | ١٢ | گ.ن.(١)، گ.هە. (١)، گ.ک. (١) | ڕستەی تەواو (١) |
| ٤ | ٢٤ | گ.ن.(٢)، گ.ک.(٥)، گ.پ. (٣) | ڕستەی هاریکار (٢)، ڕستەی یەکگرتی (٢) |
| ٥ | ١٨ | گ.ن.(٢)، گ.ک.(٣) | ڕستەی هاریکار (١)، ڕستەی یەکگرتی (٢) |
| ٦ | ٢٣ | گ.ن.(٣)، گ.هە.(١)، گ.ک. (٣) | ڕستەی هاریکار (١)، ڕستەی یەکگرتی (٢) |
| ٧ | ٢٤ | گ.ن. (٢)، گ.هە. (١)، گ.پ.(٢)، گ.ک.(٣) | ڕستەی هاریکار (٣)، ڕستەی تەواو (١) |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٨ | ١٦ | گ.ن. (١)، گ.هه.(١)، گ.پ. (٢)، گ.ک. (١) | ڕستەی هاریکار (١)، ڕستەی تەواو (١) |
| ٩ | ٢٣ | گ.ن. (١)، گ.هه.(١)، گ.پ. (٢). گ.ک.(٣) | ڕستەی هاریکار (١)، ڕستەی تەواو (٢) |
| تێکڕا | ١٧٥ | گ.ن (١٥)، گ.ک. (٢٢)، گ.هه (٦)، گ.پ. (١١) = ٥٤ | ڕستەی هاریکار (١٠)، ڕستەی تەواو (٦)، ڕستەی یەکگرتی (٨) = ٢٤ |

## ٣.٥.٢ له مۆرفێم تاكو ڕسته

ئێمە ڕستەی یەکەم، دووهەم و سێهەم لە ئاستا مۆرفێم تاکو ڕستە شیکاردەکەین.

**ڕستەی یەکەم:**

بە هاریکاریی ڕێڤەبەریی گشتی تەندروستیی پارێزگای دهوک (گرێی پێشبەندی)، تیمەکا نوژدارێن پسپور لە بوارا نەشتەرگەریی جوانکاری (گرێی ناڤی) لە ولاتا ئەلمانیا بۆ دهۆک (گرێی پێشبەندی) هاتن (گرێی کرداری).

تێبینی بکە: لە گرێی ناڤی "گرێی دووەم" گرێیەکا پێشبەندی دی هەیە (لە بوارا نەشتەرگەریی جوانکاری).

## ڕوانگەی ئەرکێن ڕێزمانی:

| بکەر | کردار |
|---|---|
| بە هاریکاری ڕێڤەبەریی گشتی تەندروستیی پارێزگای دهوک، تیمەکا نوژدارێن پسپور لە بوارا نەشتەرگەریی جوانکاری لە ولاتا ئەلمانیا بۆ دهۆک | هاتن |

## ڕوانگەی گرێ و مۆرفۆلۆجی:

| ژ | گرێ | تێبینی |
|---|---|---|
| ١ | {بە}، هاریکاری (ی)، ڕێڤەبەری (ی)، گشتی (ی)، تەندروستی (ی)، پارێزگا (ی)، دهۆک | {بە = ئامرازا پێشبەند}، {هاریکاری، ڕێڤەبەری، گشتی،تەندروستی، پارێزگا، دهۆک = ناڤ}. (ی) هێمای هەڤبەندی |
| ٢ | تیم (ەک) (ا)، نوژدار (ێن)، پسپۆڕ، {لە} بوار (ا)، نەشتەرگەری (ی)، جوانکاری | (ەک) هێمای ناڤا تاک/نادیار، (ا) هێمای هەڤبەندی، (ی) هێمای هەڤبەندی، (لە) ئامرازا پێشبەند، {تیم، نوژدار، پسپۆڕ، نەشتەرگەری، جوانکاری = ناڤ} |
| ٣ | {لە}، ولات (ا)، ئەلمانیا، {بۆ}، دهۆک | {لە، بۆ = ئامرازا پێشبەند}، {ولات، ئەلمانیا، دهۆک = ناڤ}، (ا) هێمای هەڤبەندی |
| ٤ | هاتن | کردارا دەما بوری (کۆ) |

رستەی دووەم:

ئەڤ تیمە (گرێی ناڤی) ئەمڕۆ (گرێی هەڤالکرداری) دەست بە کارا خو کرد (گرێی کرداری) و (ئامرازا یەکگرتی) بۆ نێزیکەی (٥٠) نەخوش (گرێی پێشبەندی) پشکنین کرد (گرێی کرداری).

تێبینی بکە: لە گرێی پێشبەندی یەک گرێی ژمارەیی هەیە (پەنجا نەخۆش).

**ڕوانگەی ئەرکێن ڕێزمانی:**

تێبینی بکە کو ئەڤ ڕستە، لە ڕێگەی ئامرازا یەکگرتیی "و"، لە دوو ڕستەی سەرەکی هاتییە پێک هاتن. لە ڕستەی سەرەکی دووهەم بکەر نە پێدڤی/پێویست بوو دووبارە بێتە نووسین.

| ڕستە | بکەر | بەرکار | تەواوکەر | کردار |
|---|---|---|---|---|
| ١ | ئەڤ تیمە | – | ئەمڕۆ | دەست بە کارا خۆ کرد |
| ٢ | | بۆ نێزیکەی پەنجا نەخۆش | | پشکنین کرد |

**ڕوانگەی گرێ و مۆرفۆلۆجی:**

| ژ | گرێ و هتد. | تێبینی |
|---|---|---|
| ١ | ئەڤ، تیم (ە) | (ئەڤ) جێناڤا دەستنیشانکردن، (تیم) ناڤ، (ە) هێمای دیار/تاک |
| ٢ | ئەمڕۆ | هەڤالکردارا دەمی |
| ٣ | دەست، بە، کار (ا)، خۆ، کرد | {دەست، کار = ناڤ}، {خۆ = جێناڤا خۆیی}، {کرد کردار}، (بە) ئامرازا پێشبەند، (ا) هێمای هەڤبەندی |
| ٤ | و | ئامرازا یەکگرتن |

| | | |
|---|---|---|
| ٥ | بۆ، نێزیکەی، پەنجا، نەخۆش | {بۆ= ئامرازا پێشبەند}، {نێزیکەی= هەڤالکردارا چلۆنایەتی}، {پەنجا= ژمارە}، {نەخۆش= ناڤ} |
| ٦ | پشکنین کرد | کردار |

**رستەی سێهەم:**

**پێدڤیی ڤان نەخوشان (گ.ن) وەک دەرمان یان ئەنجامدانا نەشتەرگەریی دی (گ.هە) پاشتر (گ.هە) دێتە چێکردن (گ.ک)**

**ڕوانگەی ئەرکێن ڕێزمانی**

| رستە | بکەر | تەواوکەر | کردار |
|---|---|---|---|
| ١ | پێدڤیی ڤان نەخوشان | وەک دەرمان یان ئەنجامدانا نەشتەرگەری دی پاشتر | دێتە چێکردن |

**ڕوانگەی گرێ و مۆرفۆلۆجی**

| ژ | گرێ و هتد. | تێبینی |
|---|---|---|
| ١ | پێدڤی (ی) ڤان نەخوش (ان) | (پێدڤی) ناڤ، (ی) هێمای هەڤبەندی، (ڤان) جێناڤا دەستنیشانکردن، (نەخۆش) ناڤ، (ان) هێمای دیار/کۆ |
| ٢ | وەک دەرمان یان ئەنجامدان (ا) نەشتەرگەری (ی) دی | (وەک) هەڤالکردارا پەیوەندی، (دەرمان) ناڤ، (یان) ئامرازا یەکگرتن، (ئەنجامدان) ناڤ، (ا) هێمای هەڤبەندی، (نەشتەرگەری) ناڤ، (ی) هێمای هەڤبەندی، (دی) هەڤالناڤا نادیار. |
| ٣ | پاشتر | هەڤالکردارا دەمی |
| ٤ | دێتە چێکردن | کردارا ئایندە ناچالاک |

# وەلیٚ یان ولۆ؟ وەها یان وەرکینۆ؟

لە دیاربەکر دوو مالباتێن کورد هەبوون کو دراوسێی هەڤدی بوون. هەردوو مالبات لەبەر زەبر و زۆرێن دوژمن لە گوندێن خۆ کۆچ کردبوو و لە تاخەکا هەژارنشینا باژێڕ نیشتەجیٚ بوو بوون. مالباتا یەکەم چیچی بوو کو لە شارا سەریٚ کانی هاتبوون. مالباتا دووهەم ژی ئاپ هوسیٚ پالژ بوو کو لە پالۆیی هاتبوون[50].

مالباتا چیچی لە بیست و چار خۆرت و پیاو، لە دە پیرەژن و ژنێن ناڤسەرە، هەروەها لە دوانزدە کچێن خورت پێکهاتبوو. ڤان مرۆڤان برا و برازا، ئاپ و پسمام، دۆتمام و خال و خوارزای هەڤدی بوون. مالباتا چیچی پڕ مەزن بوو لیٚ یەکێتی لە ناڤدا نەبوو. ئەندامێن ئەڤ مالباتە پشتەڤانی یەکدی نەدەکرد. بە بەروڤاژی مالباتا چیچیان، ئەندامێن مالباتا ئاپ هوسیٚ پالژ کێمتر بوون لیٚ ئەڤان یەکگرتی و یەکدەست بوون. ئەندامێن مالباتا ئاپ هوسیٚ پالژ پشتەڤانی یەکدی دەکرد و بە هاوارا یەکدی دەچوون.

ڤان دوو مالباتان حەز لە هەڤدی نەدەکرد. لە ناڤبەرا هەردوو لا گەلەک جار پەڤچوون و شەڕ دروست دەبوو. بە شەڕ و پەڤچوونا ئەوان تاخا کۆر خەتیٚ ژی بێزار دەبوو. شەڕ و شۆڕا ئەڤ دوو مالباتە لەسەر دوو مریشکان یان دوو زارۆکان

---

[50] پاش ڕەزامەندی نووسەر بابیٚ بارزان، من ئەڤ چیرۆکە لە پەرتووکا "ئەرد" وەرگرتییە. هەلبەت ئەڤ چیرۆکە، لەگۆڕ زمانا فەرمی، دووبارە هاتییە داڕشتن.

بوو. پاش هەر شەڕ و پەڤچوونەک زەلامێن هەردوو لا بەر دەستێن قەرەقۆل و پۆلیسان دەکەفتن. ئەوان ژی لە هەردوو مالباتان تێر بەرتیل وەردەگرت و خورتەک لە هەردوو لا ژی زیندان دەکرد. بەلێ، ناڤ و دەنگێن هەردوو مالبات دەشکا و دراڤێن ئەوان بۆ بەرۆکێن پۆلیسان دەچوو. دیسان زەلامێن هەردوو لا بریندار دەبوون و یەک خورت لە هەردوو مالباتژی دەکەفتە زیندان.

دواتر هەر وەک جاران، هەردوو مالبات بێچارە دەمان کو بە دراوسێتی لە نزیک هەڤدی بژین. ئەوان خودانا هزرا تەبایی و شارستانی نەبوون. لەوما ئەوان زوو پاش شەڕ و پەڤچوونا پێشتر لە یەکتر دەخست و سەرا هەڤدی دەشکاند، دراوسێ بێزار دەکرد و هەم دیسان دەستێن پۆلیسان ماچ دەکرد. بە ڤی ئاڤایی هەردوو مالبات بەردەوام تەڤ بێزار و پەریشان دەکرد.

لێ بەلێ، پڕانی بریندارێن ڤان شەڕان، نە مالباتا ئاپ هوسێ پالژ بوو، بەلکو مالباتا چیچی بوو. ئەڤە هەرچەند مالباتا ئاپ هوسێ پالژ لە مالباتا چیچی کێمتر بوون لێ ئەوان زوو بە هاوارا هەڤ دەهاتن و یەکێتی لە ناڤدا هەبوو.

مفتیی کەڤنا باژێڕا دێرکێ، مەلا کامل، لە ئەڤ تاخە دەژیا. مەلا کامل مەلایەکا نیشتمان پەروەر بوو. گاڤا ئەوی ڕەوشا خراپا ڤان مالباتان دەبینی تلیی خۆ بلند دەکرد بە ئەوان دەگوت: هەی نەزانینە! وەی خزانینە! ئەگەر هوون وسا بەردەوام هەر ڕۆژ شەڕا هەڤدی بکەن، سبەی ڕۆژ دەولەت هوون دەخاتە ناڤ ستادیۆنا فوتبۆل و هەڕی و تون بە سەر ئێوە دەکا. هۆشیار بن! لە ئەڤ خەوە ڕابن! ئیدی بەسە!

مەلا کامل لە ڕەوشا دواکەفتیی کوردان پڕ شارەزا بوو لێ ڤان مرۆڤان کو گوهداری مەلا کامل دەکرد کێم بوون.

مالباتا ئاپ هوسێ پالژ، پێنج برا بوون. چار لە ئەوان خودانا ژن و زارۆک بوون. هەر پێنج برا، پێکڤە، لە یەک جێ کار دەکرد. شوونا کارکردنا ئەوان لە فڕنەک

بوو کو هی خۆ بوو. دووان له ئەوان کارا هەڤیر و گونک بڕین دەکرد، یەکەکا دی هەڤیر کلۆردەکرد، یەکەکا دی کارا برژاندن دەکرد و ئەوی دنژی نان دەفرۆشت. هەموو یەک دەست و لێهاتی بوون. بەلێ تەنیا خێر له ئەوان دەباری.

ڕۆژەک له ڕۆژان شایی خورتەک بوو له مالباتا چیچی. هەرچەند دەرگای هەردوو مالباتان له یەکدی پڕ نزیک بوو لێ مالباتا خودان شایی، مالباتا چیچی، بانگ له مالا ئاپ هوسێ پالژ نەکردبوو. پیاوێن مالباتا ئاپ هوسێ پالژ به کارا خۆ ڕۆژانه له فڕنا خۆ خەریک بوون. ئەوان هەڤیر دەکرد، گونک دەبڕی، نان دەبرژاند و نان دەفرۆشت. لێ ئەوان جارنان ژی، بڤێ و نەڤێ، گوهداری دەنگا دەهۆل و زوڕنا ژی دەکرد و تەماشای ئاهەنگا ژن هێنانا دراوسێی خۆ دەکرد. لالۆ کوڕا بچووکا مالباتا ئاپ هوسێ پالژ، له ڤان برایان کو خودانا ژن و زارۆکان بوون پتر دەنەڕییه شایی و گۆڤەندێ. لالۆ به جەسته له فڕن بوو لێ دل و هزرا ئەوی لەکن شایی و گۆڤەند بوو. له ڕاستیدا ئەو ڕۆژه لالۆ مۆلەت له براێن خۆ وەرگرت و زوو دەست له کارا خۆ بەردا.

له ناڤەندا شایی، زەلامەک له مالباتا برۆیی، کو خزما مالا خودانا شایی بوو، مالا چیچی، له نشکاڤه کەفته سەر زەوی و بێ هۆش کەفت. ناڤبەرا مالا چیچان و برۆیان، کو له گۆلا گولێ له چیای دێرکا مازێ بوون، گەلەک خۆش بوو. هەرچەند مالباتەک له سەری کانی و مالباتەک له گۆلا گۆلێ بوو لێ ئەوان خزما یەکدی بوون. خزمایەتی له ناڤبەرا ئەوان پڕ خورت بوو. مالباتا برۆ مالباتەکا کوردپەروەر بوو. خالی وەلی، کو نەخوەش بوو و له نشکاڤه له شاییدا لەسەر زەوی کەفتبوو، له مالا برۆیان بوو. کەفتنا خالی وەلی هاوار و گازی به میڤانان خست. شایی ڕاوەستا! له شوونا دەنگا دەهۆل و زوڕنا گرین و هاوار هات.

خالی وەلی، کو لەسەر زەوی کەفتبوو، هێشتا ڕازایی مابوو لێ خالی وەلی پیاوەکا به خۆ بوو. ئەوی بەژن بلند و خودانا لەشەکا زەبەلاح بوو. قورسایی

لاشەی ئەوی سەد و پەنجا کیلۆ ڕەد دەبوو. لەبەر ئەڤ بویەرە، مالباتا ئاپ هوسێ پالژ لە کارا خۆ دەست بەردا و وەک خەلکا دی کو لە ئەوێ کۆم بوو بوون، ڕاوەستان. ئەوان ژی دڤیا هاریکاری کەسا نەخوەش بکەن.

یەکەک بانگ لە تاکسی کردبوو داکو پێکڤە نەخوەشا بێ گیان بۆ نەخۆشخانە ببەن. لێ لە گۆڕ ڤان کەسان کو لە شایی بوون ئەڤ تاکسییە کو هاتبوو بچووک بوو. لاشەی خالی وەلی هەم مەزن بوو هەم ژی گران. بە ڕاستی لاشەیەکا وسا مەزن بە ساناهی نەدەکەفتە ناڤ دەرگای تاکسی. پاشتر گەلەگ دژوار بوو کو ئەوان ئەڤ لاشەی مەزنە بە هوندرِ ژی بخەن. پەک لاشەیەکا هێند مەزن بوو!

دەست و لەپێن خالی وەلی وەک دەست و لەپێن مرۆڤ نەبوو، بەلکو مینا دەست و لەپێن فیل بوو. بەژنا ئەوی لە سەروی ١٩٠ سم بوو. پێلاڤێن ئەوی، بە کێمانی هێندەی پێلاڤێن سێ پیاوان مەزن بوو. بەلێ پێلاڤا ئەوی ژمارە ٦٥ بوو. خالی وەلی خودانا ورگەکا وسا قەلەو و بەرفرهە بوو کو لە قەدا دارگوێزەکا حەفت سەد سالی دەچوو. لەوما، گاڤا ئەوی لە کار گەڕابوو، دەولەت لەبەر لەش مەزنی کارا پاسەوانی بە ئەوی دابوو. جل و بەرگێن فەرمی، کو دەولەت بە خالی وەلی دابوو، جارانان دەدڕیا یان لە بەر کەڤن بوون لە هەڤ دەکەفت. هەنگێ خالی وەلی وەک شێوەیەکا کاریکاتۆری دەهاتە پێش چاڤ. بەلێ، شەبقەیەکا خوار و خێچ و کەڤن لەگەل چاکەتەک، کو لەبەر لەبەرکردنا سالان، وسا لە هەڤ کەفت بوو کو خەسلەت و پەسنێن چاکەت لە دەست دابوو. شەبقە بە خواری لەسەر سەر ڕونیشتبوو و چاکەت ژی لە سەر چۆگان شۆڕ بووبوو. ڕەنگا شەبقە و هەموو جل و بەرگێن فەرمی خالی وەلی قەهوەیی تاریک بوو. ئەڤ ڕەنگە ڕەنگا جل و بەرگێن فەرمیی دەولەت بوو. تەنانەت تفەنگا سەر شان ژی کەڤن بووبوو لێ خالی وەلی هەردەم خزمەتا تفەنگا خۆ دەکرد. تفەنگ لە دەست و تلێن مەزنا خالی وەلی هێندەی دەمانچەک بچووک بوو. خالی وەلی گەلەک جار

به کەیف و خۆشیڤە بۆ کەس و کارێن خۆ دەگۆت: ئەز هەتا نها یەک تەقە بە ئەڤ تڤەنگە نەکردیە! خالی وەلی هەر بە لاشە مەزن و بلند نەبوو، بەلکو ژیریی و مرۆڤایەتیی و کوردپەروەری ئەوی گەلەک بلندتر بوو. بە راستی ژی خالی وەلی لە پرانی بەزم و تۆرەیێن کوردان بە دەردەکەفت و دیار بوو. لە جەژنێن نەورۆزان ئاگر چێ دەکرد و بە دلخوەشی دەگۆت: نەورۆزە پیرۆزە! ئاگرا کاوە لە دلان جۆشە!

بە کورتی، خالی وەلی میهرەبانی خودا لەسەر ئەوی کێم نەبێ، پیاوەکا گەلەک بە خۆ بوو. سێ پیاو کەفتبوونە بن هەر لنگەکی و ئەوی بلند دەکرد. پیاوەک سەر و ملا ئەوی گرتبوو، دوو پیاو ژی، هەر یەک لە لایەک شانا ئەوی گرتبوو. دیسان چار پیاو ژی، هەر دوو لە لایەک، بن لاشەی ئەوی کەفتبوون. بەلێ بە حەفت پیاوان خالی وەلی بە دژواری لە زەوی بلند کرد. لێ چونکە دەرگای تاکسیی بچووک پڕ نزم بوو، ڤان پیاوان نەتوانی لاشەی بێ گیان بە هوندرا تاکسی بهاڤێژن. لە ڕاستیدا لاشەی خالی وەلی لە ژێر دەستێن ڤان پیاوان لە هەوادا خوار و خێچ بوو بوو.

هەر یەک، لە لایەک، بانگ و گازییەک دەکرد و دەگۆت: ئاها ولۆ! ئاها وسا نەبوو! لۆ لۆ وەها بکەن! نا وەرکینۆ نا بە! یەکێ دەگۆت: هەڕن تاکسییەکا مەزنتر بینن! یەکەک دەگۆت بچن مینی بوسەک بینن! یەکەکا دی دەگۆت: نا تراکتۆرەک بینن! یەکەکی تر دەقیران و دەگۆت: بۆ خاترا خودا دە زوو کەن! هەی هاوار هەی هاوار!

لە ناڤ ڤان قیرە و دەنگاندا کو هەر یەک پێشنیازەک دەگۆت، کەس گوهداری کەس نەدەکرد! هەر کەس بە ئاوایی دەڤەرا خۆ قسە دەکرد. هەر یەک بە زاراڤەی هەرێمی خۆ دەپەیڤی. لە بێ بەختی خالی وەلی هەر کەس دڤیا لە گۆڕ زاراڤەی خۆ سەرنجا تەڤ بۆ لای گوتنا خۆ ڕابکێشێ. وەک ئێمە لە ژوور بیست:

ئاها ولۆ، وسا نە بوو، لۆ وەها بکەن، نا وەرکینۆ و نا بە و هی دنژی! بەلێ تێنگەیشتنا هەڤپشک کاریگەری خراپ لەسەر هاریکاری ڤان خەلکان دانابوو. بە ڕاستی ژی ڤان خەلکان خودانا زمانەکا هەڤپشک نەبوون!

ئەوی دەگۆت ولۆ لە خێلا تۆری، مدیاد، لە مێردین یان لە نسێبین بوو. ئەوی دەگۆت وسا لە ئامەد بوو. ئەوی دەگۆت وەر لە مووش بوو و ئەوی دەگۆت وەرکینۆ لە گرێ سۆر بوو.

لالۆ، لە ناڤ ئەڤ هەلا هەلا و ئالۆزیدا، لە ناڤ ڤان زەلاماندا، پەیدا بوو. لالۆ خورتەک بوو لە مالا ئاپ هوسێ پالژ. لالۆ هەم کەڕ بوو هەم لال. لالۆ گۆڤەند گێڕەکا بێهەڤتا بوو. هەرچەند مالا چیچی، لەبەر ناخوەشی لە ناڤبەرا هەردوو مالاندا، بانگ لە مالباتا ئاپ هوسێ پالژ نەکردبوو لێ بەلێ لالۆ لە شایی ئامادە بوو. ئەو کەسەی کو بۆ دەمەکا درێژ سەرا گۆڤەندی گرتبوو لالۆ بوو!

لالۆ بە هەموو هێزا خۆ، خۆ بە بن قورسایی لاشەی گرانا خالی وەلی کردبوو، پشتا ئەوی خەریک بوو ببێ بە دوو قەد و بشکێ. لێ لالۆ کەسەکا لەسەرخۆ بوو. لە گۆڤەند باش دیاردەدا کو لالۆ دەستەلاتدارا ئەندامێن خۆ بوو. بەلێ هەلپەڕکێی ئەوی جوان و سەرنج ڕاکێش بوو! ئەوی نەک بە تەنیا لە گۆڤەندێن کوردی، بەلکو لە گۆڤەندێن ئەرەبسک و هەڤدەمی ژی شارەزا و چالاک بوو. کەسێن خۆ لە جێی دوور دەهاتن و لە لالۆ لاڤیان دەکرد کو لالۆ بچێ و پشکداری شایی ئەوان ببێ و سەرا گۆڤەند بگرێ. لێ لالۆ کێم جار بۆ شایی دەچوو.

لالۆ لەبەر نەبوونا زمانا هەڤپشک و نەبوونا هاریکاری لە ناڤبەرا ڤان پیاواندا نەدەزانی چی بکا. ئەوی لە بن گرانیی لاشەی خالی وەلی پڕ دلگران بوو بوو. لالۆ لەبەر لال بوونا خۆ نەدەتوانی بپەیڤێ. دیسان گوهی ئەوی پڕ گران بوو و دەنگ کێم دەبیست. لێ گاڤا لالۆ ڤیابا تشتەکا گرنگ بێژێ، یان گاڤا پڕ هێرس

ببوویا دەنگەکا زراڤ، مینا زوڕنا لە کوورایی گەوریی ئەوی دەردەکەفت. ئینجا ئەو دەم، دەنگا لالۆ باش دەهاتە بیستن!

گاڤا لالۆ دی، کو کەس کارا خۆ بە دروستی ناکا، گاڤا ئەوی دی کو ڤان پیاوان ناتوانن خالی وەلی نەخوەش و بێ چارە بە ناڤ تاکسی بخەن و هەرکەس بە ئاراستەیەک لاشە دەکێشێ، هەنگێ لالۆ لە نشکاڤە خۆ لە ژێر لاشەی خالی وەلی دەرئانی! لالۆ دەستەکا خۆ بۆ تەڤ درێژ کرد و قیرینەکا تایبەت لە کوورایی گەوریی ئەوی دەرچوو: ئوویببی! ئوویببی! ئوویببی! ئوویببی! لالۆ بە دەستا دنژی بە توندی لە سەر بانی تەکسا دا! دەنگا لێدانا دەستا ئەوی، مینا دەنگا گولە بوو کو لە لوولەی تفەنگ دەرچووبێ! بەلێ دەنگ لە هەوا دەنگ ڤەدا. هەنگێ بڤێ و نەڤێ هەرکەس لە جێیی خۆ ڕاوەستا و تەماشای لالۆ کرد! لالۆ دەستا خۆ نزیک بەر دەما خۆ برد و بە ئاماژەی دەست و تلیان بە جڤاتا حەپەساو گۆت: لە هەر سەرەک دەنگەک دەردەکڤێ! ئەڤە چییە؟ کارا خۆ بکەن و بانگ لە تەکسی دی نەکەن! نها درەنگە! خالی وەلی هەژار گەرەک زوو بە دکتۆر بگا! ڤالا نەپەیڤن و بە هەڤڕا هاریکاری بکەن! بە ڕاستی شەرمە کو ئێمە پێکڤە نەتوانی کارەکا وسا بچووک چێ بکەین! لەسەر ڤان گوتنێن لالۆ، کو لە گەوری لالۆ هاتبوودەر، هەموو بە یەک هەلپە لاشەی خالی وەلی بە ناڤ تاکسی خست. نەک هەر جێ بۆ لاشەی خالی وەلی لە ناڤ تاکسی هەبوو، بەلکو جێ بۆ کەسەکا دنژی لە کن شۆفێر مابوو. تاکسی بە لەز و بەز لە شوونا شایی و شیوەن لە بەرچاڤان بزربوو!

لێ مخابن، پاشتر خالی وەلی لە ناڤ دەستێن دکتۆران ژیان لەدەست دا و بۆ بەر دلۆڤانی خودا چوو! دکتۆرێن نەخوەشخانەێن ولاتێن داگیرکەرێن کوردستان لە قەسابێن قەسابخانەێن بازێر خراپترن! کیژ نەخوەشا بێچارە بکەفتبا دەستێن ئەوان، ئەوا دایکا نەخوەش دەگۆت لاوۆ!

ڕۆژانا دن، هەر پێنج براێن فرنەڤانا مالباتا ئاپ هوسێ پالژ لە مالا برۆ لە جڤاتا شین ئامادەبوون. لەبەر ئەو هەلوێستە جوان و پاکە، کو لالۆ لە ناڤ جڤات نیشان دابوو، مالباتێن برۆ و چیچی سوپاسا لالۆ و مالباتا ئاپ هوسێ پالژ کرد.

پاش چەند مانگان، لە هەمان جێ شاییەکا دی هاتە چێ کردن. ئەڤ جارە، شایی ژن هانینا لالۆ و کچەک لە مالباتا چیچی بوو.

لە ئەو ڕۆژەڤە، خەلک ئەو بویەرە ناخوەشە بە ئەڤ جۆرە باس دەکەن: وەلێ یان ولۆ؟ وەها یان وسا؟ وانێ یان وەرکینۆ؟ کانێ مامۆستای ئێمە لالۆ؟!

## Welê yan wilo? Weha yan werkîno?

Le Diyarbekir dû malbatên kurd hebûn ku drawsêy hevdî bûn. Herdû malbat leber zebir û zorên dujmin le gundên xo koç kirdbû û le taxeka hejarnişîna bajêr nîştecê bû bûn. Malbata yekem Ĉîçî bû ku le şara Serê Kanî hatbûn. Malbata duhem jî Ap Husê Palj bû ku le Paloyî hatbûn.

Malbata Ĉîçî le bîst û çar xort û pyaw, le de pîrejin û jinên navsere, herweha le diwanizde kiçên xurt pêkhatbû. Van mirovan bra û braza, ap û pismam, dotmam û xal û xwarzay hevdî bûn. Malbata Ĉîçî pir mezin bû lê yekêtî le navda nebû. Endamên ev malbate xemxor û piştevanî yekdî nedekird. Be beruvajî malbata Ĉîçyan, endamên malbata Ap Husê Palj kêmtir bûn lê evan yekgirtî û yekdest bûn. Malbata Ap Husê Palj piştevanî hevdî dekird û be hawara yekdî deçûn.

Van dû malbatan hez le hevdî nedekird. Le navbera herdû la gelek car pevçûn û şer dirust debû. Be şer û pevçûna ewan taxa Kor Xetê jî bêzar debû. Şer û şora ev dû malbate leser dû mrîşkan yan dû zarokan bû. Paş her şer û pevçûnek zelamên herdû la ber destên qereqol û polîsan dekeftin. Ewan jî le herdû malbatan têr bertîl werdegirt û xurtek le herdû la jî zîndan dekird. Belê, nav û dengên herdû malbat deşka û dravên ewan bo berokên polîsan deçû. Dîsan zelamên herdû la brîndar debûn û yek xurt le herdû malbatjî dekefte zîndan.

Diwatir her wek caran, herdû malbat bêçare deman ku be drawsêtî le nizîk hevdî bjîn. Ewan xudana hizra tebayî û şaristanî nebûn. Lewma ewan zû paş şer û pevçûna pêştir le yektir dexist û sera hevdî deşkand, dirwasê bêzar dekird û hem dîsan destên polîsan maç dekird. Be vî avayî herdû malbat berdewam tev bêzar û perîşan dekird.

